# ڕوانین و ڕەفتاری ئیسلام لەبەرامبەر

# مەسەلەی ژنان



ئارام ڕەشید

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

خوێنەرانی بەڕێز...!

ئەم باسەی بەردەستتان, بەشێکە لە باسێکی فراوانو هەمەلایەنە بەناوی ((جەهالەتی ئیسلامو دنیای هاوچەرخ)) کە لە ساڵی 1996 ەوە ئامادەیە بۆ چاپ.

کورتەی ئەم باسە (ڕوانینو ڕەفتاری ئیسلام لەبەرامبەر مەسەلەی ژنان) لە (یەکسانی), بڵاوکراوەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان, بە دووبەش بڵاوکرایەوە. بەشی یەکەمی لە ژمارە 20 ی ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ساڵی 1997 بڵاوکرایەوە. کە لە ئەنجامدا بووە هۆی ناڕەحەتی مەلاو پیاوە ئایینییەکانو ڕەوتە ئیسلامییەکانی کوردستانو, بەشێوەیەکی هیستیریو, بەشێوازێکی زۆر ناشیرین, پێچەوانە لەگەڵ هەر پرانسیپێکی هاوچەرخو مۆدێرن, هێرشیان کردە سەر ئەو ووتارەو, سەر بڵاوکراوەی یەکسانیو, ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانو, حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عێراق. وە بە ئاشکرا لە مینبەری مزگەوتەکانەوە, فتوای کوشتنی کۆمۆنیستەکانیاندا.

هەروەها پارتیش بۆ پشتیوانیکردن لە ڕەوتە کۆنەپەرستە ئیسلامییەکان, لە دوالاپەڕەی (هەرێمی کوردستان)ی ژمارە 132 ی ڕۆژی 1997/10/30 لەژێر ناوی (ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ژمارە 20ی بڵاوکراوەی یەکسانی)و بەناوی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە, هێرش ئەکاتە سەر ئەم ووتارەو گوایە (ئەو جۆرە بۆچوونانە بەهیچ شێوەیەك ناگونجێت لەگەڵ دابو نەریتی نیشتمانپەروەریو ڕۆژنامەگەریو, پێچەوانەی یاسای ژمارە 10ی چاپەمەنی هەرێمی کوردستانی عێراقە.)!

کاتێك ژمارە 21 ی یەکسانییان بردبوو بۆ چاپ (چاپخانەی یاسین لە سلێمانی), خاوەنی چاپخانەکە باسی ئەوەی کردبوو کە ناتوانێت بەشی دووەمی ئەم باسە چاپ بکات. چونکە ڕەوتە ئیسلامییەکان هەڕەشەیان لێداوە. هەربۆیە بەشی دووەمی ئەم باسە وەکو پاشکۆی یەکسانی ژمارە 21 بڵاوکرایەوە.

ئەوەی شایانی باسە لەم دەورەیەدا, کێشەو ململانێ لە نێوان حیزبو ڕێکخراوی سەربەخۆ لەلایەكو, ڕەوتە ئیسلامی‌یەکانو پارتی دیموکراتی کوردستان لەلایەکی‌تر زۆر توند ببۆوە. هەتا کار گەییشتە ئەوەی کە گرووهە ئیسلامی‌یەکان دەستیان بۆ ناشیرینترینو ترسنۆکانەترین چەك برد, کە ئەویش چەکی تیرۆر بوو لە بەرامبەر هاوڕێیان (شاپور عبدالقادرو قابیل عادل) لە بەرواری 1998/4/18دا, کە بۆخۆی نیشانەی ئیفلاسیو فشەڵی بیروباوەڕو نامۆیی‌یانە بە دنیای سەردەم. وە پاش چەند ڕۆژێکیش, بنکەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانیان لە سلێمانی تەقاندەوە.

هەروەها پارێزگاری شاری هەولێر(فرانسوا حەریری) بە پێی کیتابی ڕەسمی ژمارە (230)ی ڕۆژی 12|5|1998 بۆ (ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان), بە ناوی ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەڵێت کە (ڕەزامەندی وەرنەگیرا لە سەر دامەزراندنی ڕێکخراوەکەتان, بە بڕیاری ژمارە 2176ی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی بەرواری 18|4|1998 ). بەوشێوەیە ئیجازەی فەعالیەت لە ڕێکخراو وەردەگرنەوە, بنکەکەیان دادەخەنو, بڵاوکراوەی (یەکسانی)ش قەدەغە ئەکەن.

ئێمە لێرەدا تەواوی ئەم ووتارە, بۆ جارێکی‌تر لەم نامیلکەیەدا بڵاودەکەینەوە. هەروەها بەشێك لەو فتواو بەیانو چاوپێکەوتنو ڕووداوانەی ئەودەورەیە, وەکو پاشکۆ ئەخەینە بەردەستتان.

بەهیوای ئەوەی لە فرسەتێکی‌تردا بتوانین ((جەهالەتی ئیسلامو دنیای هاوچەرخ))یش لە دووتوێی کتێبێکدا بەچاپ بگەیەنینو بکەوێتە بەردەستی خوێنەران.



# ڕوانین و ڕەفتاری ئیسلام لەبەرامبەر مەسەلەی ژنان

پاش ئەوەی لایەنە بنچینەیی‌یەکانی ڕوانینو ڕەفتاری ئیسلاممان لە بەرامبەر کۆیلەو نەزمی کۆیلەداری باسکرد، ئێستا دێینە سەر توێژینەوە لەبەشێکی تری کۆمەڵی ئەو سەردەمە کە ئەوانیش هەر کۆیلە بوونەو، کۆیلە کانیشیان دووجار کۆیلە بوونە، ئەویش ژنە لە کۆمەڵی عەرەب لە سەردەمی پەیدابوونی ئیسلامو دەسەڵاتدارێتی ئیسلامدا.

ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا تەسویرێکی گشتیمان دەربارەی ژن لە سەردەمی پێش پەیدا بوونی ئیسلامدا دایە دەست، کە هەلومەرجی ژیانو کارو پەیوەندی هاوسەریو ئازادیو مافی لە چوارچێوەی هەلومەرجی ئابووری ئەو سەردەمەدا چووەتە پێشەوەو پەیوەندی بەرهەم هێنانو ناکۆکی چینایەتیو سەنگوسوکی هێزی چینایەتیو ئازادی خوازیو پێشکەوتن مۆری خۆی لە بزووتنەوەی ئەوبەشەی مرۆڤ واتە ژنان داوە.

هەروەکوو باسمان کرد ژنان لە سەردەمی پێش پەیدابوونی ئیسلام، لەوپەڕی بێمافیدا ژیانیان بەسەر بردووەو بەنیوە مرۆڤیش نەژمێردراوون .پیاو لەو کۆمەڵەدا نەك هەرخاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنان بوو، بەڵکوو خاوەن ژنیش بوو, هەروەکو چۆن خاوەن مەڕومالات و ووشترەکانی بوو.

بێگومان لەوسەردەمەوە کە ژن تیایدا جێگاو ئۆتۆرێتەی خۆی لەدەستداو، بووە ژێر دەستەی جنسی نێر، ئەو نابەرابەری‌یە لە نێوان ئەو دوو جنسەی مرۆڤدا هاتەکایەوەو مەسەلەی ژن وەك مەسەلەیەك لە کۆمەڵدا سەری هەڵداو لە بەرامبەر ئەونابەرانبەری‌یەو لە بەرامبەر ئەو زوڵمو زۆرو ستەمەدا, بزووتنەوەیەك بەرێ کەوتووە کەنیشانەی نارەزایەتیو ئیعتیرازە لە بەرامبەر ژێر دەستەیی ژنانو, ئامانجیشی هێنانەوەو گەڕانەوەی ئاستی ژنانە بۆ ئاستی پیاوو گەڕانەوەی جێگاو شوێنی ژنە بۆ جێگاو ڕێگای سروشتی خۆی وەك مرۆڤێكو هێنانە کایەوەی دووبارەی بەرابەری ژنو پیاوە.

بزووتنەوەی بەرابەری ژنان بە درێژایی مێژووی ئەم ستەمکێشییە , شێوەو شکڵی جیاوازی بە خۆیەوە گرتووەو لە هەر سەردەمو قۆناغێکی پەرەسەندنی کۆمەڵی بەشەریدا پێناسەی خۆی کردۆتەوە.

کاتێك بزووتنەوەی ئەحنافەکان وەیان دواتر بزووتنەوەی ئیسلام بە ڕەهبەری (محمد) هاتەکایەوە لە هەلومەرجی چینایەتیو ناکۆکی چینایەتیو نەزمی کۆیلایەتیو دەسەڵاتدارێتی ئەریستۆکراتیەتی قورەیشیدا، پەیوەندی خێزانی ژنو مێرد، لەچوارچێوەی سیستەمی پیاو سالاریدا بووەو ژن لەهەلومەرجێکی زۆر نزمو خراپی کۆمەڵدا ژیاوە.

بۆ (محمد)و بزووتنەوەی ئیسلام ئەم ژێردەستەییو ستەمەی کە بەسەر ژنانەوە بووە نەك هەر پێچەوانەوە نەبووە لەگەڵ ئامانجی تەوحیدی ئەو بزووتنەوەیە، بەڵکو وەك هەر ئاینێکیترو بیروباوەڕێکی کۆنەپەرستانە قازانج و بەرژەوەندیشی هەر لەونەزمو نیزامەو ئەو نەریت و دەستورە پیاو سالارییەدا بووە و ئەویش هەر هەمان سونەتو نەزمی تەئکید کردۆتەوەو هەر ئەوەشی زیاتر چەسپاندوە ,مەگەر ئەوەندەی کەوتبێتە بەر فشاری ئیعترازو نارەزایەتی بزووتنەوەی یەکسانی خوازی ژنانو ناچار بەپاشەکشە بووبێت.

بزووتنەوەی ئیسلام بزووتنەوەیەك نەبوو بۆ ژێرەوەو ژوورکردنی کۆمەڵو ئاڵو گۆڕدان بە نەزمی کۆیلایەتیو سەرلەنوێ دارشتنەوەی پەیوەندی دوو جنسی مرۆڤ واتە ژنو پیاو بەپێی هەلو مەرجێکی نوێ.

ئەم بزووتنەوەیە زادەی ئەو هەلومەرجە ماددییە بوو، وە دەبوو وەڵام دەرەوەبێت بەو بناغە ئابووریو پەیوەندە لە بەرهەمهێنان کە مەوجوودە . دەبوو پاکانە بۆ ئەو نەزمە بکاتو لە باری فیکریو ڕەوشتو یاساو...هتد, وەبەرگری لێبکاتو بینەخشێنێ . هەربۆیە لە سەروبەندی پەیدابوونی ئیسلامدا سەرباری ئەوەی لە خێزانو لە کۆمەڵدا نەزمی پیاو سالاری باوو چەسپاو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پاشماوەی ڕۆڵی ژنو نەزمی مافی دایکی هەرمابووەوە , کە نیشانەی ئەوەیە ئەم کۆمەڵەش وەك هەر کۆمەڵێکیتر, بە قۆناغی سەرەتایی بێچینو یەکسانی نێوان ژنو پیاوو ڕەچەڵەکی دایکیدا تێپەڕیوە, وە لەو بارەیەوە (محمد)یش ڕەخنەیان لێدەگرێت. تا ئەوکاتەش لە نێو هەندێك لە تیرەکاندا, منداڵ هەر بە



ڕەچەڵەکی دایك ئەخوێنرایەوە[1]. وە لە پاڵ شێوەکانیتری خێزاندا , شێوەخێزانی چەند پیاوییش تا ئەوکاتە هەرمابووەوە[2]. ئەم شێوەیە لە پەیوەندی جنسی وەك عادەتێك, بەتەنها لە ناو گەلی عەرەبدا نەبووە, بەڵکو لە یۆنانی کۆنو لەناو گەلانی ئاسیاشدا هەبووە[3]. وە کاتێك کە بزووتنەوەی ئیسلام سەردەکەوێت، ئیتر ئەم پاشماوەیەش دەسڕێتەوەو نایهێڵێت.

کەواتە ئاینی ئیسلامیش زادەی هەمان هەلومەرجی چینایەتیو پڕ لە چەوسانەوەو ژێر دەستەیی ژنو، پیاومەزنیو فەرهەنگی خێڵەکیو عەشایەری بووەو دووبارە ئەمیش بەدەوری خۆی هەمان هەلومەرجی پاراستووە و پتەوتری کردووە.

پێش ئەوەی بچینە سەر یاساکانی ئیسلام دەربارەی ژنو خێزانو، ژن لەکۆمەڵدا, پێویستە نەزەری ئیسلام دەربارەی ژن بزانین. کە دیارە نەزەرێکە ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی نابەرابەرییەو، ئەویش نەك هەر لێی بەرەخنەنییە, بەڵکو بەشێوەیەکی ترو لەبەرگی ئایندا خزمەت بەو هەلومەرجە ئەکات.

هەروەکو زانیمان هەر ئایینێك بەپێی سەردەمەکەی کەمو زۆر سوودی لە ئاینەکانی پێش خۆی وەرگرتووە کەبەدەورو پشتییەوە بووە. یەکێك لەو مەسەلانەی کە ئاینی ئیسلام لە ئاینەکانی پێش خۆیەوە وەری گرتووەو تەبلیغی کردووە، ئەفسانەی ئادەمو حەواو باسی یەکەم گوناهە( الخـ يئة الأولـ )، کە لە کتێبی تەوراتەوە وەریگرتووە.

(ئیسلام)یش پێی وایە خودا ئادەمی لە قوڕ دروست کردووە، پاشان ڕوحی بە بەرداکردووەو لە بەهەشتدا جێگیریکردوە. ئادەم بەبێ هاوڕێو هاودەم دەسوڕایەوە، خودا خەوی لێخستو پەراسوویەك لە پەراسووەکانی لای چەپی سینگی دەرهێنا بەبێ ئەوەی ئادەم هەست بکات وەیان ئازاری لێپەیدابێت[4]، (حەوا)ی لێ دروست کرد، بۆ ئەوەی

---

[1] جواد علي, المفصل في تأريخ, 258/5.
[2] صالح أحمد العلي, محاضرات في تأريخ, 145/1_146.
[3] أنجلس, أصل العائلة, ص11.
[4] الثعلبي,قصص الأنبياء, ص25.

هاودەمیی ئادەم بکات. هەروەکو لەقورئانیشدا ئاماژە بۆ ئەمە کراوەو ئەڵێت: (**هو الذي خلق م من نفس واحدة وجعل منها زوجها ليسـ ن اليها**)[5]. هەر لەم لێکدانەوە خورافی‌یەشەوە ئەوە ئەنجام گیری کراوە کە دەڵێت: پیاو ڕۆژ لەدوای ڕۆژو ساڵ لەدوای ساڵ جوانتر ئەبێت, چونکە لە قوڕ دروستکراوە، بەڵام ژن بەپێچەوانەوە هەتا بێت ناشیرین ئەبێت, چونکە لە گۆشت دروستکراوە، گۆشتیش هەتا بێت خراپو بۆگەن ئەبێت[6].

سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین کە ئەفسانەو خورافەی لەم چەشنە کە لە ئاینی ئیسلامو تەوراتدا هاتووە، لە ئەفسانەو ئەدەبی گەلانی تریشدا بەرچاو ئەکەوێت. لە ئەفسانەی ( ئەزیس)دا دەرئەکەوێت کەچۆن باسی لەدایك بوونی (ئەزوریس) ئەکات لە سەری (ئەزیس)ەوە[7]، هەروەکو چۆن (حەوا) لە پەراسووی (ئادەم)ەوە پەیدا بووە.

لەم ئەفسانەیەوە ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە بیروباوەڕی لەم چەشنەو لێکدانەوەی لەم جۆرە لە هەلومەرجێکدا پەیدابووەو سەری هەڵداوە, کە تیایدا مرۆڤ سەردەمی کۆمۆنی سەرەتایی بڕیوەو ژن جێگاو ئۆتۆریتەی بەرزی خۆی لەدەست داوەو کۆمەڵ بۆ چینەکان دابەش بووە، جنسی مێ لەلایەن جنسی نێرو بە قازانجی چینە دەسەڵاتدارەکان دەچەوسێتەوە. هەربۆیە کاتێك ئاینە بەناو ئاسمانی‌یەکان پەیدابوونە لە زەمانو زەمینێکی لەوچەشنەدا, پێویستە لێکدانەوەکانیان جووت بێتەوە لە گەڵ ئەو هەلومەرجە ئابووری ـ کۆمەڵایەتی‌یەو, خزمەت بەو نەزمو نیزامە بکات.

ئەوەی هەتا ئێستا زانرابێت ئەوەیە کە (تەورات) یەکەم کتێبە باسی (ئادەم)و (حەوا)ی هێنابێتە گۆڕ[8], بەو چەشنەی کە دواترو ئێستاش لەلای ئاینەکانی‌تری وەك مەسیحی‌و ئیسلام بڵاوە، کە ئەوانیش هەر لە تەوراتەوە وەریان گرتووە. بێگومان تەمەنی مرۆڤ زۆر کۆنەو, بەهیچ جۆرێك لەگەڵ مێژووی پەیدابوونی ئایینە بەناو ئاسمانی‌یەکان بەراورد ناکرێت،

---

(5) قرآن, أعراف:189.

(6) الثعلبي, قصص الأنبياء, ص25.

(7) أزيس و أزوريس،ترجمها عن اليونانية: حسن صبحـ الـ ري، الألف تاب (235)، دار القلم، االقاهرة، ص93.

(8) د. نوال السعداوي, الرجل والجنس, القاهرة, 1975, ص14.



کەخورافەی (ئادەم)و (حەوا)یان هێناوەتە گۆڕ. بەواتایەکی‌تر: پەیدا بوونی ئەم تەفسیرە بۆ پەیدا بوونی مرۆڤ مێژوویەکی نزیکی هەیەو، بێ ئاگایە لە مێژووی پێشووتری کۆمەڵی بەشەری‌و, کۆمەڵ بە وەستاوی‌و بەو شێوەیە ئەبینێ کە لەو زەمانو زەمینەدا بە بەرچاوی‌یەوە بووە, نەك لە حاڵەتی بزووتنەوەو گۆڕانو پەرەسەندندا. هەروەکوو ووتمان ئەم لێکدانەوەیە کالاَ بە باڵای ئەو سەردەمە بووەو ئەبێت لێکدانەوەیەك بەدەستەوە بدات کە سیستەمی پەتریارکی بچەسپێنی‌و خەبەرێك لە مێژووی یەکسانی پڕ لە شانازی ژنان نەبێت.

کاتێك ئاینی ئیسلامیش پەیدا بوو, هەمان لێکانەوەی بۆ پەیدابوونی (ژن) دایە دەست. لێکدانەوەیەك کە بۆ خۆی لە سەردەمێکی مێژوویی‌وە لە زەینی ئینسانەکاندا چەسپیوە، ووتنەوەی تووشی زەحمەتی‌یەکت ناکات. چونکە هەلومەرجی دواکەوتوویی‌و نەزانی‌و خورافەو دوور لە زانست, چوارچێوەی فیکریی مرۆڤی ئەو سەردەمانەی پێك هێنابوو، کەهاوشان بوو لەگەڵ ژێرخانی ئابووری‌و بەرژەوەندی‌یە چینایەتی‌یەکان. هەروەها لێکدانەوەیەکی وەها سووك‌و ئاسانو بەرجەستە بۆ ئەو سەردەمە, گونجاوی ئەو پرسیارە گرنگەی مرۆڤ بووە کە هەمیشە بیری لێکردووەتەوە, ئەویش چۆنیەتی پەیدابوونی مرۆڤە.

خورافەی ئادەم‌و حەوا هەوڵێکە بۆ لێکدانەوەو وەڵام دانەوەی چۆنیەتی پەیدابوونی مرۆڤ بەقازانجو بەرژەوەندی پیاو. لێکدانەوەی لەم چەشنە بە هیچ جۆرێك لە کۆمەڵی سەرەتایی مرۆڤدا نەك هەرنەبووە، بەهیچ جۆرێکیش نەیدەتوانی پەیدابێت‌و سەردەربێنێ. لەم خورافەیەدا پیاو یەکەم جار دروست کراوە نەك ژن، ئەوەی ئەصل‌و ئەساسە لێرەدا پیاوە، وەیان لە ڕاستیدا (خودا!) مەبەستی نەبووە ژن هەر دروستیش بکات، بەڵام کاتێك ڕوانیویەتی ئادەم کە بەتەنها ئەسوڕێتەوەو کەسێك نی‌یە لەگەڵیدا دابنیشێ‌و گفتوگۆیەکی لەگەڵدا بکات‌و, هاودەمیی‌بکات, هاتووە لە هەنگاوی دووەمدا (حەوا)ی دروست کرد.

بەگوێرەی ئەو خورافەیە (حەوا) لە بەشێکی زۆر بچووکی ئادەم کەپەراسوویەتی دروست کراوە، ئەمەش نیشانەی بێ‌نرخی‌و کەم بایەخی (حەوا)یە لە چاو ئادەم، ئەو پەراسووەش پەراسوویەکی چەپی سینگی ئادەم بووە! کە لە ئاینی ئیسلامو گشت ئاینەکانی تریش،

چەپو ڕاست یەکسان نین بەیـەك‌و پلـەی ڕاسـت زیـاترە وەك لـە چـەپ، هـەروەکو لـە زۆر مەسەلەی تردا ئەم لێکدانەوەیە هەیە.

کەواتە حەوا لە پەراسوویەکی چەپ دروسـت کـراوە، کـە نیشـانەی بێ‌ترخـی‌و خراپـی‌و شەڕەنگێزیەیە، ئەمە سەرباری ئەوەی ئەم پەراسووە گێڕیش بووە.

ئێستا ئەگەر بپرسین بۆچی (خودا!) بەم شێوەیە (حەوا)ی دروست کـردووە؟ ئاوهـا نـزم‌و بێ‌ترخ خولقاندی؟! ئەوە دیارە پیاوانی ئایینی هیچ وەلاّمێکیان پێ‌نی‌یە ناچار بە عـادەتی کۆنی ڕابەرەکەیان دەڵێن: (الله یعلم)! بەلاّم بۆ کەسانێك کە لە ڕوانگەی مێژووییی‌یەوە، وەیان ڕاستتر ماتریالیزمی مێژووییی‌یەوە بڕوانێتە کۆمەڵ، تێ‌ئەگات کـە (ئـادەم)و (حـەوا) خـودا دروستی نەکردوون، بەڵکو خودی ئەو مرۆڤەی کـە پێشـتر خوداکـانی لـە مێشـکی خۆیـدا دروسـت کـرد, ئەویشـی لـە مێشـکی خۆیـدا دروسـت کـرد. ئەمـەش بۆئـەوەی وەلاّم بـە پێویستی‌یەکانی هەلومەرجی چینایەتی ئەو سەردەمەو نەزمی باب مەزنی بداتەوە بەقازانجی پیاوو بەزیانی ژن.

ئەم ئەفسانەیە لـە درێـژەی خۆیـدا دەچـێتە سـەر ئـەوەی کـە چـۆن شـەیتان ( حـەوا) هەڵئەخەڵەتێنێ‌و پەیوەندی جنسی لەگەڵدا ئەکات، بەمەرجێك ئەویش هـەمان کـار لەگـەڵ ئادەم دا بکات‌و (لەخشتەی!) بەرێت، ئەمە لەکاتێکدا کە لەلایـەن خـوداوە ئـەم کارەیـان لێ‌قەدەغەکراوە. لێرەدا پرسیاری زۆرو جۆراوجۆر دێتە پێشەوە کە دەکرێت هەر لەچوارچێوەی ئەفسانەکەدا بیکەین: (حەوا ) وەك ئەوەی بەشێکی بچووکی (پەراسوویەك)ی ئادەمە, کەچی بەهێز ترە لەئادەم‌و, توانی لەخشتەی بەرێت؟ بۆچی (حـەوا) بـە تـەنها تاوانبـار بێـت, لـە کاتێکدا هەردووکیان پێکەوە هەمان کاریان ئەنجام داوە؟! ئەگەر بێ تاوانی ئادەم لەوەدا بێت کە دەسپێشکەری نەکردووە، ئەی بۆچی لێرەدا (حەوا)ش بـێ تـاوان نـەبێ، لەکاتێکـدا کـە شەیتان دەسپێشکەری‌کردووە؟ کاری جنسی بۆچـی بـەخراپ‌و گونـاه زانـراوە؟ ئـەی دەڵـێن هەموو کارێك ئیرادەی خودای لەسەرە .. ئەگەر وایە, ئـیتر چ شـەیتان‌و چ حـەوا گوناهیـان



چی‌یە, کە ئیرادەی هێزێکی خارقی لەسەرەو پێشتر دانراوە؟! خودا بۆچی بەو جـۆرە ئـیرادەی کردووە[9]؟...هتد.

ئەوی لێرەدا تێبینی ئەکرێت ئەوەیـە کـە هـەموو هـەوڵێك بـۆ ئـەوە دراوە کـە بڵێـت: پەیوەندی جنسی لەنێوان نێرومێ کارێکی خراپ‌و ناشـیرین‌و گونـاه‌و عەیبەیـە ئـەوەی لـەم نێوەشدا تاوانبارە (حەوا)یە، وە بۆیە ئەم کـارە جنسـی‌یەش بـە گونـاه ئـەزانن, گوایـە لـە فەرمانی خودا دەرچوونە. ئەوەی تەنها هۆکاری ئەم بێ فەرمانی‌یەیـە (حـەوا)یـە، هەربۆیـە خودا هەڕەشە لە (حەوا) ئەکات‌و ئەڵێت: لە تۆڵەی ئەو بێ‌فەرمانی‌یە ئـەبێت وا بکـەم ئـەو منداڵەی کەبەهۆی جووت بونتانەوە دروست ئەبێت، بەئێش‌و ژانەوە لە دایك بێت. نەك هەر ئەوەندە ... بەڵکو هەر بەهۆی ئەم گوناهەی تۆوە، ئەبێت ئەوژانە بەسەر هەموو نەوەیـەکی دوای خۆتدا بهێنم! بێگومان لەو سەردەمەدا، وایان دەزانی دنیاو کۆمەڵ هـەر بـەو شـێوەیە بووەو هەرواش ئەمێنێتەوە. نەیان ئەزانی ڕۆژگارێك دێت, مـرۆڤ ئەگاتـە ئاسـتێك لـەپێش کەوتن کە بتوانێت لەبەرامبەر (حوکمی خودایی!)دا بووەستێتەوەو ژانی منداڵبوون نەهێڵێ!

ئەوەی شایانی باسە (فاتیکان) دژی منداڵ بوونی بـێ ئێش‌وژانـە، چـونکە دژی خـوداو ئاینە[10]!! هەر لێرەشەوەیە ژنی حەیزدارو زەیستان بە پیس‌و خراپ سەیردەکرێت, بەتایبەت لە ئاینی یەهودی‌دا، چونکە ئەو دیاردانە پەیوەندی بەکاری جنسی‌یەوە هەیە، کاری جنسیش کارێکی مەکروهە! هەر بۆیە ئەو حۆری‌یانـەی کـەبڕیارە بدرێنـە بـڕواداران پـاك‌و خـاوێن‌و بێ‌حەیزن!!

بەلاّم منداڵ بوونەکـە بـەکارێکی خـراپ ناژمێردرێـت، چـونکە گونـاهی ژنەکـەی پـێ ئەشۆردرێتەوە. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لایەنگرانی ئاینی مەسیح، منداڵی تازەبوویـان دەبەنـە کەنیسەو بە ئاوی (پیرۆز!) ئەیشۆرنەوە(التعمید), وە پێش ئـەم کـارە ئـەو منداڵـە بـەپیس

---

[9] بۆ ووروژاندنی پرسیاری تری لەم چەشنە و لێکۆڵینەوە لەناکۆکی‌یەکانی ئەفسانەی ئادەم و حەوا و شەیتان، بڕوانە پەرتووکی:
_ هەمان سەرچاوەی پێشوو.
صادق جلال العـ م، نقد الفـ ر الديني. نوال السعداوي ، الرجل والجنس، ص41.
[10] نوال السعداوي ، الرجل والجنس، ص41.

دائەنرێ[11]! بەڵام بەهۆی ئەو شۆرینەوە لەو گوناهە پاك دەبێتەوە کە بووەتە هۆی دروست بوونی, واتە پەیوەندی جنسی نێوان دایكو باوکی.

هەروەها بەپێی پەیڕەوی ئاینی ئیسلامیش هەرکەسێك کە پەیوەندی جنسی لەگەڵ هەرکەسێکدا ئەکات، بەواقیعی یان لەخەودا، پێویستە خۆی بشۆرێت(غوسڵ). ئەمەش نەك لەبەر هۆی پاكوخاوێنیو تەندروستییەوە، بەڵکو بەهۆی بیروباوەڕی خورافی ئاینییەوە. چونکە لە نەزەری ئاییندا پێویستە ئەو مرۆڤەی کارێکی وەها ناشیرینو خراپ ئەکات، لە بەرامبەر خودای خۆیدا خێرا خۆی پاك بکاتەوە. ئەگەر نا.. گوناهی ئەگاتو لەلایەن خوداوە تووشی سزا دەبێت. هەروەها ئەوکەسە پێش خۆشۆرین نابێت بچێتە مزگەوتو( شوێنە پیرۆزەکان !)و دەست لە قورئان بدات...پیسیو تاوانباری ئەوکەسەش بە جۆرێکە, ئەو زەوییەی ژێر پێی کە بەسەریدا ئەڕوات لە تاوا هاوار ئەکاتو ئەزیرێنێ!!...هتد.

ئەگەر ژن(حەوا) هەر لە سەرەتاوە لە شەیتانەوە نزیك بووبێتو پەیوەندی جنسی لەگەڵدا کردبێت، بەپێی بیروباوەڕی ئاینی, ئەوا هەر لە هەمان بیرکردنەوەوە دەڵێن: ژن هەموو کاتێك لێی دوورنییە ئەو پەیوەندییە دووبارە بکاتەوە، چونکە ئەو.. دایکە گەورەی وەهابووەو سروشتو پێکهاتنی بەو جۆرەیە. هەر لەسەر ئەم بیروباوەڕە بۆگەنەوە لەسەدەی سیانزەهەمی زاینیدا, ملیۆنەها ژن بوونەتە قوربانی کۆنەپەرستی ئاینو قەشەکانو سووتێنراوون، گوایە ئەمانە پەیوەندی جنسییان لەگەڵ شەیتاندا کردووە[12].

هەروەها هەندێك لە تەفسیر نووسەکانی ئیسلامیش ئایەتی (وشارهم في الاموال والاولاد)[13] هەربەو شێوەیە لێك ئەدەنەوە .

هەر لەم ئەفسانەیەو گوناهی یەکەمەوە، ئەو ئەنجامە ئەدرێتە دەست کە ژن کەسایەتییەکی لاوازی هەیە، ناکاملو کەم عەقڵە، سۆزاوییەو زوو هەڵ ئەخەڵەتێ، زوو تووشی کاری خراپو هەڵە ئەبێت، هەربۆیە ژن نیشانەی کاری خراپو فەسادە، بۆیە

---

[11] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل5.

[12] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل19-20.

[13] قرآن، إسراء: 64. الثعالبي، فقه اللغة و سر العربية، ص118.



پێویستە لە لایەن جنسی نێرەوە چاودێریو ئاگاداری بکرێت. غافڵ نەکرێتو جڵەو بکرێت، لەنێو ڕەشماڵ وەیان چوار دیواری ماڵدا نەچێتە دەر، ئەگەر چووە دەرەوەش ئەبێت لەشی خۆی بشارێتەوە. بەم شێوەیە چاکە بەسەر خراپەدا زاڵ ئەبێت. بەپێچەوانەشەوە خراپە بەسەر چاکەدا زاڵ ئەبێتو خوداش لە تۆڵەی ئەمەدا فەلاکەتو هەژاریو قاتو قڕیو باوبۆرانو...هتد بەسەر خەڵکیدا دەبارێنێ.

ئەمانەو هەزارەها خورافەو ئەفسانەو لێکدانەوەی مەزهەبی پاش شکستی مافی دایکیو, سەرکەوتنی نەزمی خێزانی پاتریارکی هاتۆتە کایەوە, تاوەکوو خزمەت بەو نەزمەو بەکۆمەڵی چینایەتی ئەو سەردەمە بکات کە لەلایەکی ترەوە بەهۆی زەبرو زەنگو زیندانو سوپاو دەوڵەتەوە ڕاگیراوە.

کەواتە هەرچی بیروباوەڕێك کە نابەرابەری ژنو پیاو پیشان ئەداتو ڕەسمیەت بەژێر دەستەیی ژن ئەداتو لاوازیو بێ توانایيو خراپیو شتی لەم جۆرە ئەداتە پاڵ ژن، زادەی هەلومەرجێکە کە تیایدا خێزانی پاتریارکی خۆی چەسپاندووەو چینە دژبەیەکەکان هاتونەتە کایەوە.

ئاینی ئیسلامو بزووتنەوەکەی لە هەلومەرجێکی ئاوەهادا هاتونەتەکایەوە، بۆیە ئەوانیش بەش بەحاڵی خۆیان خزمەتی ئەو هەلومەرجە ئابوریو ئەو نەزمو نیزامەیان کردووە. نەزەرو لێکدانەوەشیان بەو شێوەیە بوو کە باسمان کرد.

ئەو نەزەرو لێکدانەوانەش لە ئاینەکانی پێش خۆی وەیان لە بیروباوەڕو نەریتی خێڵەکی خێڵەکانی جەزیرە وەرگرتووە، هەمان ئەو شتانەی چەسپاندوە، مەگەر ئەوەندەی لەژێر ئیعتیرازو ناڕەزایەتی بزوتنەوەکاندا وەیان بۆ بێ ئیعتیبارکردنی ئاینەکانی تر وەیان بە ئامانجی سیاسی ئاڵوگۆڕ پێدابێت.

کەواتە ئەوەی لەم ئاینەو لەم بزوتنەوەیەدا بەتەواویو بێ دودڵی غائیبە، هەڵگرتنی دروشمی یەکسانی خوازی ژنو پیاوە، لابردنی ستەمە لەسەر ژنان، بەپێچەوانەی هەوڵی نەزۆکی هەندێك لەمەزهەبییەکانی کۆتایی ئەم سەدەیە.

یەكێكی تر لەو مەسەلانەی كە جێگەی سەرنجە ئەوەیە، هەروەكو چۆن لە كۆمەڵدا پیاو خاوەن سەروەتو هۆیەكانی بەرهەمهێنان بووەو, هەر لێرەشەوە جێگەو دەسەڵاتی پەیداكردووەو خاوەن بڕیاربووە لە كۆمەڵو خێزانیشدا، بەهەمان شێوە ئەم دەسەڵاتە لە ئاینیشدا ڕەنگی داوەتەوە.

بەڵێ...! هەر لەوكاتەوە كەپیاو بووە خاوەن دەسەڵاتو شكستی گەورە بڕایە بەر ژن, ئیتر وردە وردە خوداكانو پێغەمبەرەكانیش لە ئایندا جنسیان بۆ جنسی پیاو گۆڕا، وەپاش ئەوەش كاهینەكان(خاخا، قەشە،مەلا) هەر بوونە تایبەتی نێر. ئەگەر بڕوانینە هەرسێ ئاینە بەناو ئاسمانی‌یەكە بە ئاینی ئیسلامیشەوە, ئەم مەسەلەیەی بەڕۆشنی تیادا دەرئەكەوێت، چونكە هەروەكوو باسمان كرد پیاوو ژن لە نەزەری ئاینی ئیسلامدا وەك یەك نی‌یە، پیاو باشترو بەرزو باڵاترو كامڵ ترە وەك لە ژن، ژن كەمترە لە پیاو, كەم عەقڵو نەفامو سۆزاوی‌یە، ترسنۆكو بێهێزە، بێدەسەڵاتە، زەعیفەیە سەرچاوەی شەڕو ئاشوبو فەسادە، پیاو دروشمی خێرو, ژن دروشمی شەڕو شەیتانە، پیاو نوێنەری خودایەو ژن نوێنەری شەیتانە لەسەر زەوی ....هتد.

كەواتە  لێرەوە بەوەڵامی ئەو پرسیارە ئەگەینەوە: كە بۆچی خوداكانو پێغەمبەرەكانو گشت كاری ئاینی ئەبێ سەر بەجنسی نێر بێتو ئەو حاكمو بەڕێوبەربێت، لە ڕوانگەی كۆنەپەرستی ئاینی‌یەوە؟

ئەویش لەبەر ئەوەی (خودا) خودای چاكەیە نەك خراپە، كامڵە، بەهێزە، سەرچاوەی خۆشی‌یە، هەربۆیە كەسێكی وەك (محمد)و كەسانێكی‌تر كەلەو هەلومەرجەی پەرەسەندنی كۆمەڵدا ژیاوون، تەصەوریان بۆ جنسی خودای خۆیان نێربووە نەك مێ. بەواتایەكی‌تر, هەروەكوو چۆن هەلومەرجی مادی ژیانی كۆمەڵی ئەو سەردەمەی عەرەب، بۆتەهۆی دروست بوونو پەیدابوونی خوداكانو, دابڕینی سیفاتو ڕەوشتی خێڵەكی بۆ خوداكان, بەهەمان شێوەش دابڕینی جنسێك بۆ خوداكان كە بەلای كۆمەڵێكی خێڵەكی چینایەتی باب مەزنی‌دا كە جنسی موعتەبەرو بەرێزو بەدەسەلاتە واتە جنسی نێر.



بەو شێوەیە ئاینی ئیسلام لە ئاینیشدا هەر پیاو دەكاتە كاربەدەستو دەسەڵاتدارو فەرهەنگی پیاو مەزنی ڕەواج پێ ئەدات.

بێگومان پێچانەوەی ئەم فەرهەنگە بە ئاینو خوداكانەوە بەمانای ئەوەیە كە ئەمانە كارێكن لە دەستی مرۆڤدا نینو بەزەوی‌یەوە پەیوەست نی‌یە، بەڵكوو لە دەستی خودایەو پەیوەستە بەئاسمانەوە، خودا هەر لە مێژەوە ئەم كارەی بەو شێوەیە بڕیارداوەو بەوشێوەیە ئیرادەی كردووە (وإلـ رجلك يـ ون إشتياقك وهو يسود عليك)[14]، كە دەبێت پیاو بەسەر ژندا زاڵ بێت. ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەو بەشەی كۆمەڵ واتە ژنان وەیان هەركەسێك كە ئەو ستەمە قبوڵ ناكات لەبەرامبەر ئەو كارەدا بوەستێتەوە، ئەگەر لە بەرامبەر كاری خودادا وەستانەوە, كوفرو گوناهەو جێگەی دۆزەخو ئەشكەنجەی سەختە. ئەگەرچی ناشتوانی هیچ لە بەرامبەركاری خودادا بكەیت! چونكە خودا هێزی موتڵەقی هەیەو مرۆڤی بێ هێز ناتوانێت لە بەرامبەر ئیرادەی خودای بەهێزو بەدەسەڵاتدا بوەستێتەوە هیچ لەهیچ بگۆڕێ.

بەو شێوەیە، هەر لێرەوە ئەیەوێت بزووتنەوەی ئیعتیرازیو نارەزایەتی ژنان لە بەرامبەر نا بەرابەریو ستەم پرزە لێبڕێو كەرتوپەرتی بكات, وەیان تووشی ڕاڕاییو دودڵی بكات.

پاش ئەوەی هەندێك لایەنی بنچینەیی نەزەری ئیسلاممان دەربارەی ژن باسكرد، پێویستە ئێستا درێژە بەو باسە بدەینو بزانین بەكوێ ئەگات. چونكە هێنانە گۆڕو سەرهەڵدانی ئاوەها نەزەرو لێكدانەوەیەك خۆی لەخۆیدا ئامانج نی‌یە، بەڵكو هۆیەكە بۆ گەیشتن بەمەبەستو ئامانجێك، واتە بۆ ئەوەیە بە گوێرەی چەندایەتی ئەو نابەرابەریو بێنرخی‌یەی دایئەنێن _ كە خۆی ڕەنگدانەوەی جێگەوڕێگەی ژنە لە سەردەمێكی دیاریكراودا لە بواری بەرهەمو هۆیەكانی بەرهەمهێناندا _ ئەوەندەش لە باری مافو حقوقەوە جیاوازی‌یەكە بە قازانجی پیاو ئاسایی پیشان بدەن  وەیان بەرگری لێبكەن.

[14] توراة, التـ وين, إصحاح3, الآية: 4.

له قورئاندا هاتووه ئەڵێت: (الرجال قوامون عل النساء بما فضل الله بعضهم عل بعض وبما أنفقوا من أموالهم)[15]، واته: پیاوان سەرکارو سەرداری ژنانن, لەبەرئەوەی خودا هەندێکی گەورەترکردووە لە هەندێکیتر, لەبەرئەوەی پیاوان مارەیی دەدەن[16].(ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف وللرجال عليهن درجة والله عزيز حـ يم)[17], واته: وه ژنان مافیان له سەرپیاوان هەیه, هەروەها کە پیاوان لەسەر ژنانیان هەیه, بەڵام بۆ پیاوان پلەیەك مافی زیاترهەیه, وه خودا به ووزەو حەکیمه.

لەم ئایەتانەدا هاتۆته سەر ئەوەی کە پیاو سالارو خاوەن دەسەڵاتو بڕیاره, چونکه جێگەو ڕێگەی پیاو له خاوەندێتی وایکردووه پیاو بتوانێت ژن بکڕێتو بیکاته ملکی خۆی، هەربۆیه دەبێت خێزان له سەر بنچینەی دەسەڵاتدارێتی پیاو دابمەزرێت، نەك بەپێچەوانەوه وەیان یەکسان، ئەمەش به کاری ئاسمان لێکدەدەنەوه نەك زەوی، بۆ ئەوەی دەستت له پشتەوه ببەستنەوەو پێت بڵێن: مادام ئەم کاره خودا کردوویەتی دەبێت وورتەت لێوه نەیات! خودا بۆ خۆی هەندێکی بەسەر هەندێکی تردا گەورەتر کردووه وەك پیاو بەسەر ژنەوه، خۆی ئەو نابەرابەریو نایەکسانییەی هێناوەته گۆڕ، مەگەر هەر خۆی بزانێت حیکمەتی ئەمه چییەو, مرۆڤ ناتوانێت لیٚی تیٚبگات، کاری خوداش جوانه!!

هەروەها (محمد) له شوێنێکیتر دەڵێت: (نسائ م حرث لـ م فأتوا حرثـ م أنـ شئتم)[18] واته ژنەکانتان کێڵگەی ئێوەن، بەچ شێوەیەك ئارەزوو ئەکەن بچنه سەر کێڵگەکانتانو بەکاری بهێنن.

کەواته ئەگەر پیاو سالارو سەرداربێت له خێزاندا، بەهۆی ئەوەی کە توانای ماڵی هەیەو, بەو هۆیەوه ژنەکەی کڕیوه وەیان کرێی پێکەوه بوونی داوه}ئەوەی شایانی باسه ووشەی (مهر) یان مارەیی لەزمانی عەرەبیدا ڕێـــــــــك به مانای (کرێ) دێت، هەروەکو له

(15) قرآن، نساء:34.
(16) له هەندێك شوێن سوودمان له پەرتووکی: ئادەمیزاد له کۆمەڵی کوردەواری، عبد الخالق معروف، وەرگرتووه، کە ئەویش پشتی به تەفسیری ( البيضاوي) بەستووه.
(17) قرآن، بقرة: 228.
(18) قرآن, بقرة: 223 .



چەند شوێنی تری قورئانیشدا[19] به ئاشکرا ووشەی(کرێ) بەکارهاتووه وەك ئەوەی مافی ژنه, کە دەبێت پیاو له کاتی مارەبڕیندا بیدات{. ئیتر ئەو ژنه وەك کێڵگەیەکی لیٚدێـــــت بۆ پیـــــاوو، مافی تەصەڕوف پێوەکردنی له دەستی پیاودا دەبێت. نەك بەپێچەوانەوه ژنەکه ئەو مافەی هەبێت، وەیان هیچیان نەتوانن وەك کۆیله لەگەڵ یەکتر ڕەفتاربکەن.

(محمد) له حەدیسدا ئەڵێت: (أيما إمرأة ماتت وزوجها عنها راض دخلت الجنة)[20]، واته هەر ژنێك بمرێتو پیاوەکەی لیٚی ڕازی بێت، دەچێته بەهەشتەوه. بەڵام لەم بارەیەوه باسێك له پیاوناکرێت، کە ئەگەر ژنەکەی لیٚی ڕازی بێت یان نا, چ یاساو, چ بەندو بڕیارێك ئەیگرێتەوه؟!

کەواته ئەرکی سەرشانی ژن ئەوەیه, مێردەکەی هەر چۆنێك ئارەزووی کرد..لله بەپیٚی ئارەزوو و ویستو فەرمانی ئەو بجولێتەوه، نەك بەپێچەوانەوه. چونکه (خودا!) ژنی کردۆته کێڵگەو، بووکەشووشەو، کۆیلەی پیاوو نابێت بیٚ فەرمانی خودا بکات. وه بۆئەوەی ژنەکه باشتر ببەستنەوه، ووتویانه: ئەگەر هاتوو له بەرامبەر نایەکسانیو ستەمو بیٚمافیو زۆرداریو ئیغتصابدا تەحەمولت کرد، ئەوه لەو دنیا پاداشتت بەهەشته! جائەگەر هەر ژنێك ئەو تەحەموله لەخۆی نیشان بدات، ئەوا دنیای هەتا هەتایی دەست ئەکەوێت, نەك ئەم دنیا هیچه کەچەند ڕۆژێکەو ئەبڕێتەوه!! بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو ژنەی بەم وەعدو بەڵێنه درۆینەیه هەڵ نەخەڵەتاو نارەزایەتی خۆی له بەرامبەر ستەمکێشیدا دەربڕی, ئەوا (محمد) چاری بۆ ئەم (کێشەیه!)ش دۆزیوەتەوەو ئەڵێت: (واللتي تخافون نشوزهن فعـ وهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن فان أ عنـ م فلا تبغوا عليهن سبيلا ان الله ـان عليا بيرا)[21]، واته: ئەو ژنانەی کە له قسەو فەرمانتان دەرئەچن, ئامۆژگارییان بکەنو, له

(19) قرآن، نساء:24، مائدة: 5.
(20) أبو حامد الغزالي، علوم الدين، دار الشعب، القاهرة، 1970، ص746.
(21) قرآن، نساء:34.

گەلْیان مەخەوونو, لیْیان بدەن. خۆ ئەگەر ملکەچیتانیان کرد, بەهانەیان پیْمەگرنو بەو شێوەیە ڕەفتاریان لەگەلْدا مەکەن!

کەواتە ئیسلام, ژن بەشێوەیەك ڕائەهێنێت, کە بەگوێرەی فەرمانو ئارەزووی پیاو بکاتو, نابێت بیْگوێی بکات. چونکە پیاو خاوەن ژنەو، ژن مولْکی پیاوە، خاوەن مولْکیش مافی تەصەڕوفی بە مولْکی خۆیەوە هەیە. کەواتە ژن هەر وەکو لە سەرەتاوە باسمان کرد، بۆ هاودەمیو بیْتاقەتی ئادەم دروست کراوە، دواتریش دەبێت هەمان کار درێژە پیْ بداتو, دەبێت بۆ تێرکردنی ئارەزوی پیاو هەولْبداتو خۆی وەك پەیکەرێکی بیْ گیانو هەستو, بیْ ئارەزووی جنسیو بیْ عەقلْو هۆشو خاوەن نەزەرو بڕیار تەماشا بکاتو, لە ڕیزی باقی ئەو شتومەکانە بێت کەپیاو خاوەندێتی.

ئەوەتا لە قورئاندا ڕوون تر ئەمە باس کراوەو دەلْێت: (زین للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقنا ير المقذ رة من الذهب و الفضة والخيل المسومة والانعام والحرث ذلك متاع الحياة الدنيا..)[22]، واتە: ئارەزووی ژنو مندالْو زێڕو زیوی زۆرو ئەسپی ڕاهێنراوو مەڕو مالاْتو کێلْگە, کە ئەمانە خۆشی ژیانن, لەبەر خاتری پیاو جوانو ڕازێنراوەتەوە.

هەروەکو نەزەری ئیسلاممان لە بەرامبەر ژندا باس کرد, کەچەندە بە سوكو بیْنرخ باسی ئەکات، دیارە ئەنجامی ئەمەش ئەبێت: پیاو بالاْدەستو, ژنیش بۆ پڕکردنەوەی پێویستی ئەو بێت.

هەر ئەم نەزەرە کۆنەپەرستییە وادەکات تەنانەت لە بەهەشتی درۆینەی ئیسلامیشدا، ژن نەگاتە پلەی پیاوو بەکەمتر سەیربکرێت, هەروەها مافیشی کەمتر بێت. لە کاتێکدا بیروباوەڕی خەیالْی ئەو دنیایەو زیندوبوونەوەو بەهەشت, بۆئەوەیە مرۆڤی هەژارو مەحرومی ئەم دنیایە وادار بەدنیایەکیتر بکاتو بە بەهەشتی پاش مردن دلْخۆشی بکاتو پیْی بلْێت: دلْگیر مەبە ئەو دنیات باش ئەبێت! بەلاْم لە دنیای ئیسلامدا

---

[22] قرآن، آل عمران:14.



بەڕەوا نازانرێت, تەنانەت بۆ ساتێکیش بێت دەروونی ژنان ئارام بکەنو، وادەیەکی درۆینەی ئەو دنیایان, وەك هەر وادەیەکی تری خەیالْی پیْبدەن!

ئەوەتا (محمد) ڕوو لە پیاو دەکاتو دەلْێت: (وعندهم قاصرات الـ ـرف أتراب)[23]، واتە: بۆ ئەو پیاوە بڕوادارو خواپەرستو بەهەشتییانە, ڕۆژی دوایی لەو بەهەشتەی کە گفتیان پیْ دراوە, ژنی وەهایان دەدرێتی کەچاو لە دەرنینو تایبەت بەخۆیانن.

وەیان دەلْێت: ( ذلك و زوجناهم بحور عين)[24]، واتە ئەوانەی بەهەشتین ژنی جوانی سپیو چاوگەشیان ئەدرێتیْ. بەلْیْ! لەودنیاش ژن لە ستەمگەری پیاوو نابەرابەریو چەند ژنە ڕزگاری نابێت!!

بەو شێوەیە دەبینین, کە چۆن ئەم ئایینە ڕوودەکاتە پیاوو وادەی حۆریو ژنی جوانیان پیْ ئەداتو, هەولیْ ڕازی کردنی ئارەزوو و شەهوەتیان ئەدات. کە ئەزانێت وادەدان بەژنی جوان کاریگەری هەیە، بۆیە پێویستە لەو شتانەوە دەست پیْ بکات کە ئەتوانێت پیاو ڕابکێشێتو هەلْیخەلْەتێنی. بە تایبەت بۆ خەلْکی نەدارو زەحمەتکێش, کە ئەبینن داراو دەولْەمەندان هەر لەم دنیایەداو بە بەرچاوی ئەوانەوە کام ژن ئارەزوو بکەنو بەچ ژمارەیەك بیانەویْ, ئەتوانن دەسگیری خەن. ئەوانیش بەوادەی ئەو حۆرییانەو بیرکردنەوە لە ژیانی دەولْەمەندان دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە.

هەروەها پێشیان ئەلْێن: دلْنیابن لەوەش کەئەو ژنانەی ئێمە ئەتان دەینیْ, بەتەواوی مولْکی خۆتانەو هیچ کەسێك دەست بۆ ئەو مولْکە نابات، چونکە ئێمە بەجۆرێك دروستمان کردوون کە چاو لەدەرنەبن!

ئەگەر لەقورئاندا هەروا بەکورتی ئەم شتانە باس کراوە، بەلاْم لە حەدیسو حکایەتی بەر دیوەخانی (محمد)و خورافەکانی تریەوە، کە هاوڕیْو لایەنگرانی گویْیان لیْبووە، زۆر دوورودرێژترو بە ژمارەو تەواوی مواسەفاتەوە باسی پاداشتو حۆریو لیستی خواردنەکانی

---

[23] قرآن، ص:53.
[24] قرآن, دخان: 55.

بەهەشت ئەکرێت، کەمایەی گاڵتەجاڕییە! بەو شێوەیە ئەبینین ئەوەی قسەی لەسەر نییە, ژنو ئارەزووی سروشتییەتی وەك مرۆڤێکی ئاسایی.

کاتێك باسی ژن ئەکەین لە نەزەری ئیسلامەوە، کە ئەڵێن: ژن موڵکی پیاوە، واتە ئەم خاوەندێتییە سەرتاپای ژیانو هەڵسو کەوتو جلوبەرگو ڕاو نەزەرو مەسائیلە دەروونیو جنسییەکانیش ئەگرێتەوە.

بەڵێ! ژن کۆیلەی پیاوەو موڵکی پیاوە لە ئیسلامدا، پێویستە بە تەواوی خۆی لە (نامەحرەم!) بشارێتەوەو خۆی بپۆشێ. ئازاد نییە چ جلو بەرگێك لەبەر ئەکات، ئەبێت بە ئارەزووی باوكو برا وەیان مێردەکەی بێت، ژن سەرچاوەی فەسادو خراپەیە, هەروەکو دایکە (حەوا)ی! بۆیە پێویستە پیاو نەهێڵێت ژن لە ماڵ بچێتە دەرەوە، ئەگەر زۆر پێویستیش بوو ئەوا پێویستە مۆڵەت لە پیاوەکەی وەرگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێت عەباو لەچكوحیجاب بکات، چونکە ئەرکی سەرشانی پیاوە پارێزگاری لەماڵو موڵکی خۆی بکات بەهەر ڕێگەیەك کە پێی باشە. ئەمەش ئەکاتە پارێزگاری لە شەرەفی خۆی, چونکە ژن پێوانەی شەرەفمەندی پیاوە!!

کاتێك ژن لە ئیسلامدا بەموڵکی پیاو دابنرێ، مانای ئەوەیە ئەو مافە بەپیاو ئەدات، کەی وەبە چ شێوەك ڕێگە بدات ژنەکەی بچێتە دەرەوە یان نەچێت، بۆئەوەی ژنەکە نەبێتە جێگە سەرنجی پیاوێکی ترو بەو هۆیەوە ڕێگەیەك نەدۆزرێتەوە بۆ پێشێلکردنی خاوەندێتیو شەرەفی!

کەواتە ئەگەر جلوبەرگێك کە ژن ئارەزووی بکات، وەیان چوونە دەرەوەیەك کە ژن پێی خۆش بێت, وەیان پێویست بێت، ئەگەر پیاوەکە ڕازی نەبێت نابێ بیکات. کردنەوەی دەرگای زیندان وەیان نەکردنەوەی, دیاری کردنی ماوەی چاو پێکەوتنو لەگەڵ کێ, وەیان نا, بە بڕیاری پیاوە. پیاو پاسەوانو زیندانەوانی ژنە. خۆئەگەر پیاو( باوك، برا، مێرد) بەم ئەرکە هەڵنەستێ لەڕوانگەی ئایینەوە تاوانبارە.

بۆیە هەمیشە مەلاو ووتاربێژی ئیسلام ڕووئەکەنە پیاوو, بە لۆمەو بە ترساندن, بە ناوی ئایینو بە بزواندنی سونەتو دەماری پیاومەزنی خێڵەکی, بۆ تێژکردنەوەیان لە بەرامبەر ژنو



ئازادییەکانیدا, تەبلیغاتی پەرتووکاوو داڕزیوی خۆیان ئەکەن. بڕوانە ئەم ئایەتە: (وقل للم منات يغضضن من أبصارهن ويحف ن فروجهن ولايبدين زينتهن إلا ما هـر منها وليضربن بخمرهن علـ جيوبهن ولا يبدين زينتهن إلا لبعولتهن)[25] واتە: ئەی پێغەمبەر بە ژنە بڕوادارەکان بڵێ: با چاوی خۆیان دانەوێنن لە تەماشاکردنی ئەو پیاوانەی نامەحرەمن، هەروەها بالەشو داوێنی خۆیان بپارێزنو جوانی خۆیان دەرنەخەن, مەگەر ئەو شوێنانەی کە ناتوانرێت بشاردرێنەوە. هەروەها با ملو گەردنیان داپۆشن مەگەر بۆ مێردیان نەبێت.

ئەگەر ژنێك بەگوێی مێردەکەی نەکردو بەو شێوەیە نەکات کە (خودا بە پێغەمبەر!)ی ووتووە_کە ئەویش بەهەموو پیاوێك ئەڵێت_ ئەوا پێویستە دارکاری بکرێت. بەڵام پیاو، وەك ئەوەی پیاوە، مرۆڤێکی ئازادە، خاوەن خۆیەتی، کامڵە، عاقڵە...هتد, بۆیە لە هەڵسوکەوتو چوونە دەرەوەو هاتوچۆکردنو پەیوەندیگرتنو جلوبەرگ لە بەرکردنو پەیوەندی جنسی لەگەڵ ژمارەیەکی بێسنوور لە ژناندا ئازادە.

پیاو بە پێی دەستوری ئیسلام نەك هەر خاوەن ژنەکەیەتی، بەڵکو خاوەن (بەرهەمی!) ژنەکەشە، واتە منداڵەکان. هەربۆیە چۆنیەتی سەرپەرشتیو ڕەفتارکردن لە گەڵیاندا و دیاری کرنی چارەنووسیان... هتد, بەمافی پیاو دەزانێت. ئەرکی سەرشانی ژنە, پیاوەکەی چۆنی دەوێت.. بەو شێوەیە منداڵی بۆ پەروەردە بکات. چونکە پیاو خاوەن داراییو هۆیەکانی بەرهەمهێنانە لە کۆمەڵداو, لە خێزانیشدا خاوەن دەسەڵاتو خاوەن ژنو بەرهەمەکەیەتیو پێویستە منداڵ بە ڕەچەڵەکی پیاو بناسرێتەوە.

ژن لە ئاینی ئیسلامدا هەر لە سەرەتاوە, بۆ خۆشی پیاو دروستکراوە، بۆی نییە بەهیچ جۆرێك خۆشیو ئارەزووی خۆی نیشان بدات, وەیان هەوڵی دابینکردنی ئارەزووی جنسی خۆی بدات. ئەمە کارێکە تایبەت بە پیاوەو پیاو بڕیاری لەسەر ئەدات، ئەویش بە گوێرەی هەوەسو ئارەزووی خۆی.

---

(25) قرآن، نور:31 .

له نەزمی باب مەزنی‌دا, پیاو بۆی هەیە ئارەزووی جنسی خۆی بەڕاشکاوی باس بکاتەو شانازی پێوەبکات، هەروەکو (محمد) بە شانازیو موبالەغــەوە باســی توانــای جنســی خــۆی ئەکاتو ئەڵێت: کە توانای جنسی چل پیاوی پێدراوە[26]. هەروەکو خێڵە عەرەبەکانی ئــەو سەردەمە نەزەریان لە سەر پیاوەتیو کەڵەمێردی پیاو ئــەوەبووە: کــەم خــۆری زۆر پــەڕبێت. جالەم نەزمەدا, پیــاو نــەك هــەر بــۆی هەیــە ئــارەزووی جنســی خــۆی دەربخــاتو شــانازی پێوەبکات، بەڵکو لە تێرکردنی ئەو ئارەزووەشدا ئازادە. بەڵام بۆ ژن بەپێچــەوانەوە... نــەك هەربۆی نی‌یە ئارەزووی جنسی خۆی تێربکــات، بــەڵکو دەرخســتنی ئــارەزووی جنسیشــی، کارێکی ناشیرینەو، شانازی‌یە ئەگەر کەسێکی ساردو سڕبێتو ئــارەزووی جنســی مردبێــت. هەربۆیە هەتا ئێستاش ژنان ئارەزووی جنسی خۆیان ئەشارنەوەو چەند ئارەزووشــیان هــەبێت وەك کەسێکی سارد خۆیان نیشان ئەدەن!

ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا، باســی ئــەوەمان کــرد کــە چــۆن لــە نــەزمی پیــاو مەزنی‌دا, پیاوان _ بەتایبەت سەرەك خێڵو سەرکردە سەربازی‌یەکانو داراو دەوڵەمەندان _ چۆن خێزانی چەند ژنە پێك ئەهێنن[27]. ئەمە دیاردەیەکی گشتی‌یەو کۆمــەڵی عــەرەب لــە پێش پەیدابوونی ئیسلامیش بەدەر نەبووە لەو شــێوە خێزانــە. (تەبــەری) لــە ( زوحــاك)ەوە دەگێڕێتەوە: کە پیاو هەبووە خاوەنی دە ژن بووە[28].

کاتێك بزووتنەوەی ئیسلام لەو زەمانو زەمینەدا سەری هەڵدا ئەو شــێوە خێزانــە(چــەند ژنە)ی بەلاوە سەیرو نامۆ نەبوو. نەك هەر ئەوەندە ... بەڵکو ئەویش وەك نەزەرو ســوننەتی باوی ئەو سەردەمە خێڵەکی_ بــاب مەزنی‌یــە، بــە کــارێکی ئاســاییو سروشــتی ئــەزانی, سەرباری هەر ناڕەزایەتیو ئیعتیرازێکی ژنان لە بەرامبەریدا.

بۆیە لە سەرەتاوە هیچ ڕەخنەیــەکی لــەم بارەیــەوە نــەبووە، بــە پێچــەوانەوە ...دواتــر بەیاسای ئیسلامو حوکمی ئیلاهی, ئەم جەریمەیەی بە ڕەسمــی ناســاند. ئــەوەتا لــە قورئانــدا

[26] ابن سعد، بقات، دار التحرير، قاهرة، 1970، 139/8.
[27] بڕوانە ئەم باسە، ل.
[28] بري، تفسير، 157/4.



هاتووە ئەڵێت: (فاذ حوا ما اب لـ م من النساء مثن وثلث ورباع)[29]. واتە: ئــەو ژنانەی کە دڵخوازی خۆتانن دوو دوو, سێ‌سێو چوارچوار بیهێنن. دواتر ئەڵێت: (فإن خفتم الا تعدلوا فواحدة). واتە: ئەگەر ترسان لەوەی دادوەر نەبن لە نێوانیاندا, ئەوا تەنها ژنێك بهێنن! هەروەها دەڵێت: (ولـن تستـ يعوا أن تعدلوا بين النسـاء ولـو حرصتم فلا تميلوا ل الميل فتذوروها المعلقة)[30]. واتە: ناشتوانن ئەو دادوەری‌یە لە نێوان ژناندا بپارێزن، بەڵام کارێکی وەها مەکەن کە وازی لێبهێننو, ئەو ژنە بە موعەللەقی بمێنێتــەوە. واتە: نەئەوەتا هیچ پەیوەندی‌یەکی جنسی لە گەڵدا بکرێتو, نە ئــەوەتا بــە یــەکجاری وازی لێبهێنرێت تاوەکو بۆ خۆی شوویەکی تر بکات. بەو شێوەیە (محمد) قسەی پێشای خۆی پووچ ئەکاتەوەو دڵنیات ئەکات کە ناتوانیت دادوەربیت لە نێوانیاندا. سەرباری ئەوەش وازناهێنێ لە چەند ژنەو, هەر سورە لەسەر بڕیاردان لەسەر چەند ژنە(هەروەکو بۆ خــۆی چــەندین ژنــی هێناوە), بەڵام ئەڵێت: جارجارە لایەك لە ژنە پێشینەش بکــەرەوە!! وەیــان چــارەیەکی تــری داناوە کە ئەڵێت: ( فـإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو مـا ملـ ـت أيمانـ م)[31]. واتــە: ئەگەر ترسان لەوەی دادوەر نەبن لە نێوانیاندا کەنیزە پەیدا بکەن! ئالێرەدا ئیتر (محمد) ئــەو تۆزە ترسەشی نامێنێ لە (دادوەری!) نێوان ژنەکانداو ئەڵێت کــەنیزە پەیــدا بکــەن! چــونکە لەنەزەری (محمد)و ئاینی ئیسلامدا, کەنیزە بە مرۆڤ ناژمێردرێت, کۆیلەیە، ئازاد نی‌یە, وەك مەڕو بزن کڕینو فرۆشتنی پێوە ئەکرێت. هەربۆیە (محمد) بێ دەربەستانە خــەڵکی ڕێنــوێنی ئەکاتو ئەڵێت: کەنیزە پەیدابکەن! وە بــەپێی توانــای خــۆت چــەند دەتوانیــت: دە، ســەد، هەزار... لەو کەنیزانە بکڕەو هیچ ترسێکیشت لە (دادوەری!) نەبێت لــە نێوانیانــدا! بــەڵێ ئیسلامی مرۆڤ دۆستو مودافیعی ژن، ئەم مرۆڤانە بە مرۆڤ ناژمێرێت, تەنها لە بەرئــەوەی لە شەڕی ئیسلامو ئیمپراتۆرەکان, بەزۆری سەرەنێزەو شمشــێر دەســگیرکراوون. دوای ئــەوەی

[29] قرآن، نساء:3.
[30] قرآن، نساء:129.
[31] قرآن، نساء:3.

باوكو براو مێردیان قەتڵو عام كراوون, وەیان هەر بە بەرچاوی ئەوانەوە, بەزۆری زۆردارەكی ئەدرێنە موسڵمانانێك كە ئەو غەزایەیان لە ڕێگەی (خودا!)دا كردووە!!

ئەو دادوەرییەی(محمد) باسـیئەكات لێكدانـەوەیجۆراوجۆری بـۆكراوە. چـونكە(محمـد) بۆخۆی بەڕۆشنیو بەموشەخەصی ئەو دادوەرییەی ڕوون نەكردۆتەوە, هەربۆیـە لێكدانـەوەو بۆچوونی جیاواز لەو بارەیەوە پەیدا بووە. بـەپێی ئایـەتی (3)ی سـورەتی (النسـاء) بێـت مەبەستی لە پەیوەندی جنسیشە، چونكە هەروەكوو باسمان كرد كە ئەڵێت: ئەگەر جارجارەش ئاوڕ لە ژنە گەورەكەت بدەیتەوە ... هەروەكوو (محمد)یش باسی كردووە كە ناتوانرێـت ئـەم (دادوەری!)یە بپارێزرێت. بەڵام هەندێك لە تەفسیرنووسەكان, ئەم دادوەرییە بە دادوەریكردن لەجلوبەرگو خواردنو مەسرەف كردن لێك ئەدەنەوە, نـەك بـە دادوەری لـە خۆشەویسـتیو مەسەلە دەروونییەكاندا.[32]

بەڵێ! ئیسلام دوای ئەوەی هەمان پەیوەندی هاوسەری خێڵەكی چینایەتی _ باب مەزنی دەچەسپێنێ، كە بۆ خۆی هەر لە سەرەتاو ئـەوەڵی كـارەوە, دووره لـە هـەر پەیوەندییـەكی سروشتی نێوان ژنو پیاو, كە لەسەر بنچینەی عیشقو خۆشەویسـتی ئـەو دوو مرۆڤـەو بـە ڕەزامەندی هەردوولابێت _ بەڵكو بەپێچەوانەوە كۆكردنەوەی چوار ژنی ئازادو سـەدان ژنـی كەنیزە, لەژێر حاكمیەتی زۆردارانەی تەنها پیاوێك, یاسـاو نـەریتێكی پـەرتوكاوو دژی ژنو دژی مرۆڤایەتییە _ كە بۆخۆی هەر لە سەرەتاو ئەوەڵی كارەوە دووره لە هەر دادوەرییەك. ئـەوجا دێـتو دەیـەوێت باسـی دادوەری بكـات! دادوەرییـەك لـە ڕوانگـەی كۆنەپەرسـتی ئیسلامەوە, دادوەری ئەوەی: جارجارە لایەك لە ژنە گەورەكە بكەیتەوە, یـان جلوبـەرگیان وەك یەك بۆبكەیت!!

بەڵێ! لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوە بە ناعەدالەت دانانرێ كە بەزۆری زۆردارەكی چەندین ژن بخرێتە ژێـر حـوكمی ئـارەزووی تـەنها پیاوێكـەوە، كـە بـۆ خـۆی كۆیلایەتییـەكی بـێ ئەملاوئەولایە. دادوەرییەكەیشی, دادوەریو یەكسانی بوونی ئەو كۆیلانەیـە (ژنـەكان) لـە

(32) القر بي، تفسير، 5/20-22 السيو ي، تفسير الجلالين، 1/27.



ڕادەی چەوسانەوەیان. بەواتایەكیتر, ئەو یەكسانیو دادوەرییەی ئیسلام باسی دەكات، واتە: كاكیموسڵمان! بۆت هەیە چەندین ژن بكەیتە كۆیلەی خۆت، بەڵام لە نێوان ئـەو كۆیلانـەدا فەرقو جیاوازی مەكە، ئەگەر چی ناشتوانی فەرقو جیاوازی نەكەیت!!

بەڵێ حەسركردنی ژمارەی مونافیسەكان بەچوار(كە لە ڕاستیدا بەچوار حەسرنییە)یش یان كەمتر وەیان زیاتر، هیچ لە واقیعی ئەو جەریمەو ئازارو ناڕەحەتیو دڵەراوكێیەی ژنی یەكەم ناگۆڕێ كە هەستی پێئەكات. چونكە هێنانی ژنێك بەسەر ژنی یەكەمدا, بە مانای ناكـافی بوونی ئەو ژنەیە بۆ بەشداری كردن لە ژیانی ژنو مێردایەتیو, لەولاشەوە ئازادنەكردنێتی بۆ ئەوەی مونافەسەی ژنە تازەكەشی پێبكات.

هەروەكو ئاشكرایە (محمد) كۆمەڵێ ژنـی هێنـاوە (كـە بـریتین لـە: خەدیجـە, عائیشـە, حەفصە, ئوم حەبیبە, ئومسـەلمە, سـۆدە, زەینـەبی كچـی جـەحش, مەیمونـە, جوەیرییـە, صەفییە, زەینەبی كچی خەزیمە, هەروەها دووانی تریش كە وازی لێ هێنـاون[33].جگـە لـە چەندین ژنو كەنیزە, كە یان خۆیان پێشكەش بە محمد كردووە, وە یان لە ئەنجامی غەزاكاندا بۆ خۆی زەوتی كردوون.) كە ئەوەش یەكێكە لەو مەسەلانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا, لە نێوان ڕەخنەگرانو لایەنگرانی ئیسلامدا, چەندوچوونی زۆری لەسەر هەیە.

پیاوانی ئایینی ئیسلام, بەشێوەی جۆراوجۆرو بە بروبیـانووی بێشـەرمانە, بـەرگری لـە ڕابەرەكەیان ئەكەنو, دەیانەوێت (محمد) بێ تاوان لەو تاوانانە دەربهێنن. ئێمـە نامانـەوێت, لێرەدا ئەم باسانە بكەینەوە كە قسەو ڕەخنەی زۆری لەسەر هەیە, مەگەر ئاماژە بۆ هەندێك لایەنی بكەین.

هەروەكو باسی هەلومەرجی ماددیو شێوەی بیركردنەوەو عەقڵیەتی كۆمەڵی كۆنمان كرد، بە كۆمەڵی عەرەبیشەوە, كە چۆن لە سایەی نەزمی خێڵەكی چینایەتی ـ باب مەزنیدا، پیاو دەسەڵاتداربووەو بۆی هەبووە كۆمەڵێك ژن لەژێر حوكمی ئارەزووی خۆیدا ڕاگـرێو, ئـەوەی

(33) إبن هشام, سيرة, ج4,ص1058.

بۆیان گرنگ نەبووبێت، ڕاونەزەرو ئارەزووی ژن بووە. دیارە ئەم مافەش لە باری واقیعی‌یەوە بۆ داراو دەوڵەمەندەکان بووە, چونکە بۆ پیاوی نەدار ئەم کارە(فرە ژنی) زەحمەتە.

کاتێك (محمد)یش لە کۆمەڵی ئەو سەردەمەی مەککەدا هاتەکایەوە، بەو عەقڵیەتو ڕەووشتەوە گەورەبوو، وە دواتریش هەمان سوننەتی باوی ئەوکاتەی تەئیدکردو, وەك هەر سەرەك هۆزو سوپاسالارو داراو ئەشرافێك, هەمان کردەوەی چەسپاند. ئەوەی شایانی باسە بۆ ئەوکاتەو بۆ ئەو سەردەمە, (محمد) تووشی ڕەخنەو ناڕەحەتی‌یەك نەبوو لە لایەن کۆمەڵەوە بەشێوەیەکی گشتی, هەروەکو ئێستا لایەنگرانی (محمد) کەوتوونەتە ژێر ڕەخنەو فشارەوە (دیارە مەبەستمان ئەوەنی‌یە کە ئەویش ڕووبەڕووی نارەزایەتی بزوتنەوەی یەکسانی خوازی ژنان بەگشتی‌و, ژنەکانی خۆی نەبووەتەوە. ئەگەر بڕوانینە ئەوسەرچاوانەی کە باسی پەیوەندی خێزانی (محمد) ئەکات، ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە چۆن ناخۆشی لە نێوان(محمد)و ژنەکانی‌و, لە نێوان ژنەکان خۆیاندا هەبووە. وە چۆن نارەزایەتی خۆیانیان دەربڕیوە بەهۆی ڕاگیرکردنی چەندین ژن‌و, ستەمێك کە بەسەریانەوە بووەو هەستیان پیٚ‌کردووە). بەپێچەوانەوە ... بەهۆی ڕەووشتو سونەتی باوی ئەوکاتەوە, چەند ژنە وەك کارێکی ناشیرین‌و تاوان بەحیساب نەهاتووە. بەڵکو نیشانەی پیاوەتی‌و, شانازی بووە. بۆیە بۆ ئەو کاتە ئەم جەریمەیەی (محمد) لە چاوی باوی کۆمەڵەوە، ئیجابی بۆی گەڕاوەتەوە.

بەڵام دیارە کۆمەڵ بەو شێوەیە نامێنێتەوە وەك (محمد) دەیبینی, نەیدەزانی سەردەمێك دێت ئەو ئیجابی‌یە بە سەلبی‌و, ئەو شانازی‌یە بە جەریمە لەسەری دەکەوێت. نەی دەزانی سەردەمێك دێت, کە جیٚنشینانی بۆ دیفاع لەو کردەوانە تووشی شەرمەزاری ئەبن لەبەرامبەر بزووتنەوەی یەکسانی خوازی ژنان‌و ئازادی خوازی دنیادا.

بێگومان لایەنگرانی ئیسلام بۆ پاکانەکردن لەم کارەو هێنانەوەی هەر مەسەلەیەك بە شێواوی, ناتوانن ئەو ڕاستی‌یە بشارنەوە کە: ئەوەی (محمد) کردوویەتی هەر هەمان ئەوکارەیە کە مرۆڤێکی خێڵەکی داراو دەوڵەمەند لە سەردەمی کۆمەڵی ئەوکاتەی جەزیرەدا کردویەتی.



هەندێك جار دڵیان بەوە خۆش ئەکەن کە (محمد) تا ئەوکاتەی (خەدیجە) ماوە ژنی تری نەهێناوە. دەیانەوێت بەو شێوەیە وەڵامێکیان بۆ مرۆڤی سەدەی بیستەم هەبێت!

بەڵیٚ! بەپیٚی ئەو سەرچاوە مێژوویی‌یانە بێت، ئەمە ڕاستە. بەڵام ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە بۆچی هەتا (خەدیجە)مابوو, ژنی تری نەهێنا؟ ئەی بۆچی لە پاش مردنی, ڕیزی لیٚبەستو لەسەر هەمان شێوە بەردەوام نەبوو؟! لایەنگرانی ئیسلام ئەڵێن: لەبەر ئەوەی (محمد) (خەدیجە)ی خۆش ویستووە! ئێمەش لەوەڵامدا ئەڵێین: هەمان ئەو سەرچاوانە کەباسی ئەم خۆشەویستی‌یەی (محمد) بۆ خەدیجە ئەکەن، باسی خۆشەویستیشی بۆ (عائیشە)ش ئەکەن! ئەی بۆچی لەگەڵ ئەوەشدا, چەندین ژنی تری بە سەریدا هێناوە؟ تۆ بڵیٚی خۆشەویستی بۆعائیشە نەبووبێت؟ ئەی ئەگەر وایە بۆچی ژیانی خێزانی لە گەڵدا هەر درێژە پیٚ داوە؟ تۆ بڵیٚی لەنێو کۆمەڵێك ژندا یەکێکیانی خۆش نەویستبیٚ, بۆیە ئەو هەموو ژنەی بەسەر یەکدا هێناوە؟! ئەی ئەگەر وایە, بۆچی ئەو هەموو ژنەی پێکەوە ڕاگرتووە؟! ئەی چۆنە وا ئیزدواجی لەگەڵ کەسێکدا نەئەکرد کە خۆشی‌بوێت ... ؟!

دیارە ئەم وەڵامە بەهیچ جۆرێك خۆی ڕاناگرێتو لەهەموو لایەکەوە تێك ئەشکیٚ. بەڵام وەڵامی ڕاست هەر ئەوەیە: هەروەکو باسمان کرد کە (خەدیجە) ژنێکی داراو ئەریستۆکراتی قورەیش بووە. ئەم جۆرە ژنانەش بە حوکمی دەسەڵاتی ئابووری‌یان لە هەندێك کاتدا، مافی هەڵبژاردنی هاوسەرو تەڵاقیان هەبووە. وەیان هەندێك مەرجیان هەبووە لە شووکردندا, بۆ ئەوەی پیاوان نەتوانن هەموو شتێکیان بەسەردا بسەپێنن. هەربۆیە (محمد) نەیئەتوانی ژنێکی‌تر بەسەر خەدیجەدا بهێنیٚ. وەکو باسمان کرد تەنانەت (محمد) بۆ بەسەربردنی ژیانی هاوسەری‌یان, چووەتە ئەو خانووەی کە هی خەدیجە بووە[34] بەڵام کاتێك کە (خەدیجە) مرد, ئیتر (محمد) لەژێر ئەومەرجانە هاتە دەرو ڕیزی لیٚبەست. ئەمەش بەتایبەت لە کاتێکدابوو کە وەك سوپاسالارو وەك میرێك لەناو لایەنگرانیدا دەرکەوتو, بەهۆی تالاٌنی‌و پێنج

---

[34] بڕوانە ئەم باسە, ل.

یەکەوە, دارایی سەربەخۆی خۆی زیادی کردو، پێویست بوو وەك هەر سەرەك خێڵێو میرو شایەك ڕەفتاربکات.

خۆ ئەگەر (محمد) پێویستی بەوە هەبوو کە خزمایەتی زۆری هەبێت(وەکو پیاوانی ئایینی باسی دەکەن ), وەیان خاوەن منداڵو کوڕی زۆر بێت, وەیان ئارەزوی جنسی خۆی بخاتە کارو, هەموو ئەمانە لەسەر حیسابی تاوانو چەوسانەوە لەبەرامبەر ژناندا بێت، ئەوا ئەبوو هەر لە سەرەتای لاوێتیی‌یەوە, واتە هەر لەو کاتەی کە خەدیجە لە ژیاندا مابوو, ئەوانەی بکردایە, کە بۆ (محمد) ئەو مەسەلانە لەو سەرەتای کارەیدا گرنگی زیاتری هەبوو. بەڵام هەر لەبەر ئەو هۆیەی کە باسمان کرد, نەیدەتوانی ئەوانە بکات. کە ئەمەش دیسانەوە دروستی وەڵامەکەی ئێمە پیشان ئەدات.

کەواتە (محمد)یش نەك هەر ڕەخنەی لە جەریمەی چەند ژنە نەگرتووە، بەڵکو بەقسەو بەکردەوە هەمان ئەخلاقی‌یەتی چەسپاندووە, لە کاتێکدا ئەگەر بە کارێکی نادروستی بزانیبایە، وەیان بە باشی نەزانیبایە, ئەوا بەلای کەمەوە خودی خۆی ئەو کارەی نەدەکرد. جا ئەگەر هاوڕێیانو جێ‌نشینانی دوای (محمد)و, داراو دەوڵەمەندانی ئیسلام, ئەم کارەیان کردبێت، ئەوا هەمان سونەتی خێڵەکی‌و هەمان ڕەسمو یاسای ئیسلامیان بردۆتە پێشەوە.

بەڵێ ...! متوکل(4000) چوار هەزار کەنیزەو، ڕەشید (2000) دوو هەزار کەنیزەو, معتصم (8000) هەشت هەزار کەنیزەیان هەبووە[35]. کەبەپێی قورئانو سوننەتی (محمد), جەریمە وەیان کارێکی ناڕاستیان نەکردووە. ئەم داراو دەوڵەمەندو خەلیفەو پادشایانە بەپێی حوکمی قورئانو دەستووری ئیسلام, بۆ دامرکاندنەوەی شەهوەتی جنسی‌یان، ئەوەندە هەزار ژنی تایبەت بەخۆیان هەبووە. کە لە هیچ ( فەسادخانەیەکدا!) ئەو ژمارەیە بەرچاوناکەوێت. بەڵێ ... ! ئەمە ڕەوشتی بەرزی ئیسلامە!

[35] خلیل احمد خلیل, المرأة العربية و قضايا التغير, ص70.



بەپێی ئەو نەزەرە بنچینەیی‌یەی کە ئیسلامو گشت ئایینە بەناو ئاسمانی‌یەکان هەیانە، هەندێك لایەنی حقوقی‌و جێگاو ڕێگای ژنمان لەخێزاندا باس کرد. هەر لەسەر هەمان بنچینەوە، پێویستە هەندێك لایەنی تری ئەم باسە لێك بدەینەوە.

ئێمە باسی ئەوەمان کرد، کە پیاو خاوەنی ژن بووە لە کۆمەڵی ئەو سەردەمەی ئیسلامدا، جا ئەگەر ئەو ژنە هێشتا شووی نەکردبێ کۆیلەی باوكو برابووە. هەر کاتێکیش بە شوودرا, خاوەندێتی ئەگۆڕێت بۆمێردەکەی. کەواتە خاوەن ئەو ژنەی کە هێشتا شووی نەکردووە (باوك یان برا)، بۆی هەیە چارەنووسی ژنەکە بەپێی ئارەزوو ویستو بەرژەوەندی خۆی دیاری بکات. ئەمە یاسای خێڵەکی۔ چینایەتی کۆیلایەتی‌و دەرەبەگایەتی بووە. بۆیە کاتێك ئایینی ئیسلامیش لەو هەلومەرجەدا سەری‌هەڵدا، نەك هەر لەبەرامبەر ئەمەدا نەوەستایەوە، بەڵکو هەمان نەزمی بەڕەسمی ناسی‌و باشتر چەسپاندی, کە دەڵێت: (فانكحوهن بإذن أهلهن)[36].واتە: جا بە ئیجازەی کەسەکانیان مارەیان بکەن. هەروەکو باشترین نموونەیەکیش لەم بارەیەوە مارە بڕینی عائیشەی حەوت(یان شەش) ساڵە, بۆ (محمد)ی پەنجاو دووساڵەیە. بێگومان (أبوبکر)ی باوکی (عائیشە), کە یەکەم جێگری (محمد)و هاوڕێی نزیکی بووە، هەر ئەو بەشووی داوەو, لەو تەمەنەدا عائیشە نەك هەر خەبەرێکی لەوکارە نەبووە، بەڵکو مانای شوکردنیشی نەزانیوە. نەك هەر ئەوکاتەی کە مارەیان بڕیوە، بەڵکو لەوکاتەشدا کە (محمد) گواستوویەتی‌یەوە، کەتەمەنی نۆساڵو محمدیش پەنجاو چوار ساڵ بووە! هەروەکو عائیشە خۆی دەگێڕێتەوە، نەی زانیوە بۆچی داویانەتە دەست (محمد), تەنانەت بووکۆکەو یاری‌یەکانیشی لەگەڵ خۆیدا بردووە[37]. سەبارەت لە بەشوودانی عائیشەو چەندینی تریش لەو تەمەنە کەمەدا, کە مێژوو باسی ئەکات, ڕەخنەی زۆر ئاراستەی محمدو ئیسلام کراوە. مودافعینی ئیسلامیش بۆ بەرگری لەو جەریمەیە وەڵامی نازانستی‌و دوور لە واقیع ئەدەنەوە, گوایە بەهۆی گەرمی ناوچەی جەزیرەوە کچ زووتر گەورە

[36] قرآن, نساء: 25.
[37] صحیح مسلم.

ئەبێو پێئەگات! بەڵام ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە میللەتی عەرەبیش وەك میللەتانی دواکەوتووی ئەو سەردەمە هیچ حیسابێکیان بۆ ژن نەکردووەو, ژنان لەوپەڕی چەوساندنەوەدا ژیانیان بەسەر بردووە. ئەوەتا بەپێی یاسای ڕۆمانەکان تەمەنی شووکردن دوانزە ساڵ بووەو, لە هیندستان لە هەشت ساڵی کچیان بەشوو داوە[38]. محمدیش لەو کۆمەڵگاو لەو سەردەمەدا ژیاوە, بۆیە هەمان عەقڵی‌یەتی هەبووەو هەمان عادەتو ڕەووشتی چەسپاندووەو پەرە پێداوە.

کەواتە لە دەستووری ئیسلامدا, ژن وەك هەر کۆیلەیەکی‌تر لە فرۆشتن(شوکردن)یدا, هیچ پرسێکی پێ نەکرێتو ڕایەکیشی وەرنەگیرێت, نادروست نی‌یە.چونکە ژن مافی دەخاڵەتی لە چارەنووسی خۆیدا نی‌یە. بەپێچەوانەوە ... ئەو ژنەی کە چارەنووسی خۆی بەبێ چەندوچوون, دایە دەستی باوکی‌و, ئەوەی باوکی بڕیاری لەسەردا, ئەو قسەیەکی تێدا نەکردو, مل کەچی فەرمانی باوکی بوو، ئەوا بۆ ئەو جێگەی شانازی‌یەو, لە نەزەری ئەو کۆمەڵەدا بە ژنێکی ڕێكوپێكو بە ئصول دەژمێردرێت, لەبەر ئەوەی لەقسەی باوکی دەرنەچووە. چونکە لە سەردەمی پەیدا بوونی ئیسلامدا, پێویست بووە منداڵ (بەتایبەت مێبینە) بەتەواوی ملکەچی فەرمانی باوکی بێت. باووك چی ووت، دەبێ هەر ئەوەبێت(دروست یان نادروست ), کە دیارە ئیسلامیش هەر ئەمەی پەرەپێداوە. بەپێچەوانەشەوە, واتە: بێ فەرمانی کردنی باوكو گەورەی خۆت, بێ شەرمی‌و شورەیی‌و دەمەوەری‌یە...!

بەڵێ! بەم شێوەیە چارەنووسی ژن لە لایەن پیاوەوە دیاری ئەکرێت.خۆشی جگە لە ملکەچ بوون, نابێ هیچی‌تر بکات! وەك ئەوەی ئەم مەسەلەیە هیچ پەیوەندی‌یەکی بەژیانو چارەنووسی ئەوەوە نەبێت!

کاتێکیش کە ژن چووە لای مێرد, مافی بەو شێوەیە دەبێت کە باسمان کرد. هەر ناڕەزایەکی‌یەکیش لە بەرامبەر ئەو شێوە ڕەفتارەدا, بە ئەشکەنجەو کوتەك کاری وەڵام

[38] د. کمال مەزهەر أحمد, ئافرەت لە مێژوودا, ل19.



ئەدرێتەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی لە نەزەری باوی کۆمەڵدا, بێفەرمانی‌کردنی مێرد, بەبێ شەرمی‌و بێحەیایی دەژمێردرێت! خۆ ئەگەر مێرد, ژنەکەی ئەشکەنجە کردو, چەند ژنیشی بەسەردا هێناو هیچ مافێکی بۆ نەهێشتەوە، وەیان بە کورتی‌یەکەی بەپێی نەزمی کۆیلایەتی‌و خێڵەکی‌و بەپێی یاساو بڕیاری ئیسلامی, دۆزەخی بۆ پێکهێنا... ژن ئەتوانێ واز لە مێردەکەی بهێنێ؟ ئەتوانێ بڕیار لە سەرکۆتایی‌هێنان بەو ژیانە پڕ لە ئەشکەنجەیە بدات؟ بەواتایەکی تر مافی جیابوونەوەو تەڵاقی هەیە؟

بێگومان کۆمەڵگای کۆن بە ئایینی داڕزیوی ئیسلامیشەوە, ئەگەر نابەرابەر بڕوانێتە ژنو پیاو و، هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە تەفسیرێکی خورافی‌و نزم بۆ ژن بکاتو، بەگەورەترین تاوانبارو سەرچاوەی فەسادی بزانێت، وە پێی وابێت کەم عەقڵەو دەبێ لە زینداندا بێت( بۆئەوەی شەڕ بەسەر خێردا زاڵ نەبێت). هەروەها پیاو وەك ملکی خۆی ڕەفتاری لە گەڵدا بکاتو چارەنووسی دیاری بکات. لە ئیزدواجی‌دا چۆن دەیفرۆشێو, کام کڕیار بە باش دەزانێت بیداتە ئەوکەسە ... دەبێ چاوەڕێی ئەوەی لێبکرێت کە مافی جیابوونەوەو تەڵاق بە ژن بدات؟! بێگومان نەخێر!

کاتێك باووك بڕیاری بەشوودانی کچەکەی ئەدات، بەبێ دانانی نرخێك لەسەری وەك هەر کاڵاو هەر ئاژەڵێك بەیعی نەهاتووە. بۆیە بەپێویستی ئەزانێت نرخێك وەیان کرێیەك لەسەری دابنێت، ئەگەر چی کەمیش بێت. یەکێك لەو مەسەلانەی کە کەسانی مەزهەبی شانازی پێوە ئەکەن ئەوەیە کە ئەڵێن: ئایینی ئیسلام لانی زۆری کرێی ژنی دیاری کردووەو نابێت لەوە زیاتر وەربگیرێت! ئەوەی پێویستە لێرەدا بیڵێین ئەوەیە کە: ئایینی ئیسلام بڕیاری لەسەر کرێی ژن داوە, وە بەبێ دیاری‌کردنی ئەو کرێیە(هەر چەند کەمیش بێت), ئەو ئیزدواجە بەتاڵە. کەواتە مەسەلەی بنچینەیی لێرەدا چۆنیەتی ڕوانینە بۆ ژن. وەك ئەوەی ژن کاڵایەکە کڕینو فرۆشتنی لەسەرە؟! وەیان نەخێر...! مرۆڤێکەو هەرچی‌یەك کە پەیوەستە بە ئیزدواجی‌یەوە، کاری شەخصی خۆیەتی‌و تیایدا ئازادە؟ وەڵامی ئەمەش دیارە, کە ئیسلام وەك کاڵایەك دەڕوانێتە ژن.

کەواتە دانانی هەر نرخێك لە ناوەڕۆكدا, هەریەك ماناو مەبەستی هەیە، ئەویش بەكالاّ دانانی ژنو كڕینو فرۆشتنیەتی. جا ئیتر كەسانێك لەو چوارچێوەیەدا بێنەو بردە بكەن، مانای ئەوەیە چەندو چوون لەسەر چۆنیەتی دانانی نرخی كالاّكە ئەكەن، بەنرخێكی بەرز یان نزم, نەك لەسەر كالاّ بوون وەیان نەبوونی.

کەواتە دانانی هەر نرخێك لەسەر ژن, نیشانەی فرۆشتنو تەسلیم كردنێتی بە پیاوێكیتر, واتە مێرد. هەربۆیە مێرد مافی گشت شتێكی بەسەر ئەو ژنەوە هەیە، بە مافی جیابوونەوەو تەلاّقیشەوە.

بەلاّم ژن وەك كۆیلەو كالاّیەك، كە خاوەن خۆی نییەو مولّكی پیاوە, بۆی نییە ئەو عەقدە هەلّوەشێنێتەوە كە بەهۆیەوە بووەتە كۆیلەی پیاوەكەی، ئەگەرچی پڕ لە ئەشكەنجەو ناڕەحەتیش بێت!

ئەگەر ئەمە یاساو ڕەووشتی كۆمەلّی كۆن بووە، كە هەتا ئێستاش لە زۆر شوێنی دنیادا هەر درێژەی هەیە، ئیسلامیش هەمان یاساو ڕەووشتی تەئكید كردۆتەوە. نەك هەر ئەوەندە بەلّكو ئەرزوحالّی چینە داراو دەسەلاّتدارەكانیشی بردووەتە ئاسمانو, مۆرو ئیمزای ئیلاهیشی بۆ لێداوون!! بڕوانە ئەم سوورەتانە: البقرة: 226- 232، 236-237، 241،الأحزاب :49، المجادلة:1-2، الطلاق :1-2، النساء:19, كە دەبینیت بە چ شێوەیەك, بۆ مافی جیابوونەوەو تەلاّق, بەتەنها ڕوو لە پیاوكراوە و, ئەوەی باسی لیٚنەكراوە مافی ژنە لەم مەسەلەیەدا، مەگەر وەرگرتنی كریٚی لەش(مارەیی).

بێگومان ئەم هەموو بیٚ مافیو ستەمو چەوسانەوەیە, سەرچاوەو زەمینەی ماددی پەیدابوونی لەشفرۆشیو, پەیوەندی جنسی لە دەرەوەی خێزان, پێك ئەهێنێت. ئەمەش دیاردەیەكە هەر لەو كاتەوەی خێزان بە قازانجی پیاو گۆڕانی بەسەردا هاتو, سەرەتاكانی نەزمی پیاو مەزنی پەیدابوو, ئەویش هاتەكایەوە. لەسەردەمی پێش پەیدابوونی ئیسلام, دیاردەی لەشفرۆشیو پەیوەندی جنسی لە دەرەوەی خێزان، دیاردەیەكی بلاّوبووە. تەنانەت لە



شارەكانی وەك (مەككە)و (تاییف), بۆ لەش فرۆشی, شوێنی تایبەتی هەبووە, كە بۆ نیشانە, ئالاّی تایبەتییان هەلّ كردووە[39].

كاتێك بزووتنەوەی (محمد)ی لەو هەلومەرجەدا سەری هەلّدا، نەك هەر ڕەخنەی لەو نەریتو ڕەووشتو بیروبۆچوونانە نەگرتو, لە بەرامبەریدا نەوەستایەوە، بەلّكو گشت ئەوانەی چەسپاندو ئاوی (پیرۆز!)ی ئیسلامی بەسەرداكرد.

هەروەكو چۆن لەو كۆمەلّگا چینایەتی ـ باب مەزنییانەدا(بە كۆمەلّگای عەرەبی ئەو سەردەمەشەوە)، كە چینە داراو دەسەلاّتدارەكان, خۆیان هۆكاری فەسادو گشت دیاردەیەكی دزێوی كۆمەلّ بوون, كەچی یاساو حوكمی خۆیان لە بەرژەوەندی چینایەتیخۆیانەوە دەركردووەو, چینەكانی خوارەوەی كۆمەلّیان پیٚ تاوانبار كردووە.

لە قورئاندا هاتووە ئەلّێت: ( الزانية والزانی فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة ... الزانـي لاينكح إلا زانيـة أو مشركة والزانيـة لاينكحها إلا زان أو مشـرك وحرم ذلك على المؤمنين )[40]. واتە: سەد دار لە ژنو پیاوی زیناكەربدەن ... پیاوی زیناكەر تەنیا ژنی زیناكەرو, ژنی موشریك ئەتوانیٚ بۆخۆی مارە بكاو, ژنی زیناكەریش تەنیا ئەتوانیٚ شوو بە پیاوی زیناكەر یا پیاوی موشریك بكا, وە ئەم كارە بۆ بڕواداران حەرامە.

ئەم یاساو بڕیارانە لە دنیای واقیعدا ڕووی لە چینەكانی خوارەوەی كۆمەلّەو, هەرچی داراو دەولّمەندانیشە, بە هۆی داراییو دەسەلاّتیانەوە هەموو شتێكیان بۆ فەراهەمەو, ئەم یاسایانە نایانگرێتەوە.

كاتێك كە ئیسلام دەسەلاّتی گرتە دەست، شوێنە ڕەسمییەكانی لەش فرۆشی داخستو نەیانیهێشت. .هەروەكو لە قورئاندا هاتووە, ئەلّێت: ( ولا تكرهوا فتياتكم على البغاء

[39] إبن حبيب، المحبر، ص 340. الطبري، تفسير، 18/55-57.
[40] قرآن، نور: 2 .

وإن أردن تحصنا لتبتغوا عرض الحياة الدنيا)[41], واته: وه كەنیزەكانی خۆتان بۆ بەدەستهێنانی ماڵی دنیا ناچار بە زیناو خۆفرۆشی مەكەن, ئەگەر ویستیان پاك بمێنن.

بەڵام نە جەڵدەو نە بڕیاری داخستنی ئەو شوێنانە, نەبووە هۆی لە ناوبردنی لەشفرۆشی. چونكە لەشفرۆشیو ئەو هەلومەرجەی كە باسمان كرد, لازمومەلزومی یەكنو, هەتا سەرچاوەی واقیعیو ماددی ئەو دیاردانە كوێر نەكرێتەوە، بە بڕیارو توندو تیژی چارەسەر ناكرێت. داخستنی ئەو شوێنانەو جەڵدە لێدان لەو كەسانەی كە پەیوەندی جنسی پێكەوە ئەكەن, بەبێ ئەوەی ئیزنیان لە كاهینەكانی ئیسلام وەرگرتبێو, بە بێ ئەوەی ساتو سەودای كڕینو فرۆشتنەكە بە دەڵاڵی مەلاكان بووبێت، وەك هەمان كاری جمهوری ئیسلامییە, كە ئەو شوێنانەی داخستووە, بەڵام ئەو دیاردەیە بە نهێنی, وەیان بە ئاشكراو بە ڕەسمی, بە ئیزنی دەوڵەتو بە قەرارو بڕیارێك كە ئاخوندەكان ئیمزای ئەكەن هەر درێژەی هەیە.

ئەم قسانەشمان بە هیچ جۆرێك، بەو مانایە نییە كە: نە (محمد)و نە (خومەینی) لە هەوڵی لەناوبردنی دیاردەی لەشفرۆشی بوونە. بەپێچەوانەوە, بزووتنەوەی ئەمانە بۆ خۆی پارێزەری زەمینەی سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیەن. لە كاتێكدا خۆیان وانیشان ئەدەن, كە بەربەرەكانێی ئەو دیاردەیە ئەكەن, هیچ واقیعەتێكی نییە. بەڵكو ئەوان تەنها بەربەرەكانی لەگەڵ ئەو دیاردەیەدا ئەكەن, كە پەیوەندییەكی سروشتیو ئازادی, ئینسانەكانە, كە بەبێ ئاگایی ئەوان بووبێت. ئەوان ئەوەیان بەلاوە گرنگ نییە, ئەو پەیوەندییە جنسییە, پەیوەندی سروشتیو ئازادی نێوان ئینسانەكانەو بەڕەزامەندی هەردوولا پێكهاتووە یان نا! هەر بۆیە ئەوەی ئەوان كردوویانەو ئەیكەن, لە ڕاستیدا پەرەپێدانی لەشفرۆشیو ئیغتصابەو, خۆیان گەورەترین تاوانیان لە بەرامبەر ئەو مەسەلەیەدا كردووە.

بەڵێ ...! ئەوەی ئیسلامو گشت ئاینو بیروباوەڕی كۆنەپەرستیو دەزگاو دەوڵەتی چینەكانی سەرەوەی كۆمەڵ كردوویانە، پەرەپێدەرو هۆكاری دیاردەی لەشفرۆشیو پەیوەندی

(41) قرآن, نور: 33.



جنسی دەرەوەی خێزانن. چونكە ئەو شێوە خێزانەی ئەمان چەسپاندوویانە, بە پێی قازانجو مەرجی ئابوورییە, نەك مەرجیسروشتی[42]. بۆیە لە ڕاستیدا ئەم جۆرە ئیزدواجە, هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ لەشفرۆشیدا نییە. مەگەر لەوەدا كە: ژن بە شێوەی پارچە لەشی خۆی نافرۆشێت, هەروەكو لەوانی تردا هەیە، بەڵكو بە یەكجارو بەیەك كەڕەتو هەتا سەر, لەشی خۆی وەكو كۆیلەیەك ئەفرۆشێت[43].

كەواتە ئایینی ئیسلامیش بەهەمان شێوەی كۆمەڵگای كۆن, سزای توندی بۆ ئەو كەسانە داناوە كە بەپێی دەستوری ئیسلام ئیغتصاب ناكەن. نەك لەبەر ئەوەی ئەم كارە بە كارێكی نامرۆڤانە، یان هەر شتێكی تری لەم چەشنە دەزانن, بەڵكو بە دەست درێژی بۆ شەرەفو موڵكیەتی خەڵكی ئەژمێرن. وە لە ڕاستیدا سزای توندی ئیسلام لێرەوەیە. ئەگەر نا... هێنانی چوار ژنی ئازادو سەدان ژنی كۆیلە, وەیان داگیركردنی ئەو ژنانەی كە بەزۆری سەرەنێزە, لە مێردیان جیا ئەكرێنەوەو,خۆیانو منداڵەكانیان بەسەر قارەمانانی غەزادا دابەش ئەكرێن, فەسادو جەریمەو ئیغتصابو گەورەترین تاوان لە مێژووی بەشەریدا نەبێت چییە ؟!

لە كۆتاییدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە دیاردەی پەیوەندی جنسی لە دەرەوەی خێزان, لە سەردەمی خودی (محمد)یشدا, سەرباری هەر زەبروزەنگو سزایەكی توند لە بەرامبەریدا, بە تەواوی دەرئەكەوێت.

لە ئارادابوونی چەندین ئایەتو تەئكید كردنەوە لە سەری, بۆخۆی بەڵگەی ئەو ڕاستییەیە. هەروەها پەیوەندی جنسی نێوان عائیشەی ژنی محمد لەگەڵ (صفوان كوڕی مەعتەل ) باشترین نمونەی ئەو دیاردەیەیە، كە هەراو هورییایەكی زۆری لەسەر پەیدابوو. وە هەرچی خەڵك هەبوو پێی زانیو بەم هۆیەوە (محمد) كەوتە بەر ڕەخنەی زۆری موسڵمانەكانو بەو هۆیەوە زۆر بێتاقەت بوو. ڕۆژێكیان لە مزگەوت ووتارێك ئەداتو ئەڵێت: بۆچی

(42) انجلس، أصل العائلة، ص81-82 .

(43) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل90.

موسڵمانەکان سەبارەت بەخێزانەکانم ئازارم ئەدەن؟ ئیتر کار ئەگاتە ئەوەی کە (عائیشە) بتۆرێو بچێتەوە بۆ ماڵی باوکی. وە بەو هۆیەوە نەخۆش ئەکەوێتو مانگێك لە جێگەدا ئەکەوێت. جا(محمد) پرسی بە هەندێك لە موسڵمانەکان کرد کە چیبکات؟ لە وەڵامدا (علی) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا, هەر ژن زۆرە بۆ تۆو, پەکت لە ژن ناکەوێت. بەڵام بنێرە بەشوێن (بەربەرە)ی کەنیزەو پرسیاری لێبکە! (بەربەرە)یان هێناو (عەلی) ئەشکەنجەیکردو هەڕەشەی لێدا(مەسەلەکە پەیوەستە بە(عائیشە)وە, کەچی ئەم کوتەك کاری ئەکرێت! ئەمە ڕەفتاریان بووە لەگەڵ کەنیزەکانیاندا)و پێی ووت: هەرچییەکت لە(عائیشە) بینیوە بۆ پێغەمبەری بگێڕەوە! ئەویش لە وەڵامدا ووتی: هیچ خراپەیەکم لێی نەدیوە ... بەڵام کاتێك کە هەویر ئەشێلم, بە(عائیشە) ئەڵێم ئاگاداری بکە, خەوی لێئەکەوێتو مەڕومالات هەویرەکە ئەخوات.

دواتر (محمد) ئەچێتە ماڵی ئەبوبەکرو دەست ئەکات بە ئامۆژگاریکردنی عائیشەو, داوای لێئەکات کە تۆبە بکات ئەگەر کاری لەو جۆرەی کردووە( ئەمە لەکاتێکدا کە ئەگەر یەکێکی تر وای بکردایە داوای تۆبەی لێ نەئەکرا، بەڵکو سەنگەسار ـ ڕەجم ـ ئەکرا). (عائیشە)ش بۆ بەرگریکردن لە خۆی ئەڵێت: ڕۆیشتووم دەستبەئاوبگەیەنم, ملوانکەکەم لێبزربووە بێئەوەی کە ئاگام لێبێت. کاتێك کە پێم زانی,گەڕامەوە ئەو شوێنە تاوەکو بیدۆزمەوە, ئەمەش لە کاتێکدابوو کە لەشکرخەریکی گەڕانەوە بوو(چۆنە وا, لەوکاتەدا کەسی ئاگادار نەکردووەتەوە, کە ئەی زانی لە لەشکر بەجێ ئەمێنێت؟!), ئیتر لەشکر پێی نەزانیو بەجێیان هێشتم. بەڵام دوایی(سەفوان)م بۆپەیدابوو, کەبەهۆی هەندێك کاری پێویستی خۆیەوە, لە لەشکر دواکەوتبوو(چۆنە وا ڕێك کەوت, کە سەفوانیش لە لەشکر دوابکەوێت, وە کەس لێی ئاگادارنەبێت؟! وە پێویستی چی؟!). ئەوەی شایانی باسیشە (عائیشە ) کەسێکی جنسی بووە, هەر بۆیە لەسەر نۆرە شەوی خۆی شەڕو هەرای کردووە. بێگومان کۆکردنەوەی نۆ ژن لەیەك کاتدا[44] هەر بەو ئەنجامە ئەگات.

[44] صحيح مسلم, ج4. قرآن، نور:4.



کاتێك (محمد) هەستی بەوە کرد کە وورده وورده مەسەلەکە بەقازانجی خۆی ئەشکێتەوە(لە لایەن ڕای گشتی موسڵمانەکانەوە)و, (عائیشە)ش هیچ نادرکێنێ, پاش لێکۆڵینەوە, تۆزێك خۆی بێدەنگ ئەکاتو, یەکسەر ئەڵێت: ئەوا لە خوداوە وەحیم بۆ هات, کەوا (عائیشە) کاری وای نەکردووە[45], وە خودا ئەڵێت: هەرکەسێك شتی وەهای بۆیەکێکیتر هەڵبەستو, چوارشایەتی نەبوو، ئەوا هەشتا جەڵدەی لێبدەن. (والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء فاجلدوهم ثمانين جلدة ولا تقبلوا لهم شهادة أبدا وأولئك هم الفاسقون)[46]. واتە: وە کەسانێك کە تۆمەتی زینا, لە ژنانی داوێن پاك ئەدەنو, لە پاشان چوار شایەت بۆقسەی خۆیان ناهێنن, هەشتا جەڵدەیان لێبدەنو, ئیتر قەت شایەتییان لێقبوولْ مەکەنو ئەوانە فاسقن. بەپێی ئەم بڕیارە تازەیە(بەبێ ئەوەی پێشتریش ڕاگەیەنرابێت!)، هەشتا دار لە (مستح )و (حسان ـ ی کوڕی سابت) و (حمنە ـ ی کچی جحش) درا, کە باسی ئەم ڕووداوەیان کردبوو[47].

11نیسان 1996

[45] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[46] قرآن، نور:4.
[47] إبن الأثير، الكامل في التأريخ، ص 132 ومابعدها . إبن هشام، سيرة، 764/3 -773.

# پاشكۆ

## چەند بەشێك لە فتوای مەلایەك بە ناوی (مەلا بەشیر)، لە پەیوەند بە ووتاری (ڕوانین و ڕەفتاری ئیسلام لە بەرامبەر مەسەلەی ژنان):

... بەڵام بەداخەوە، لەو زەمانە كەسانێك پەیدابوون، چ پیاو چ ژن، مەجموعە ئافرەتێكی بێئابڕوو، بێئیمان، قین لەدڵ، كەبوونەتە دار بەدەست مەجموعە كەسانێكی خوانەناس، دوژمنی ئیسلام، دەیانەوێ بمانگەڕێننەوە بۆ بەرەڵایی.

خۆیان ناویان لە خۆیان ناوە بەرەڵا، بە سەربەخۆ، دەیانەوێ ئێمەش بكەن بە سەربەخۆ، یانی بەرەڵا. ئەوانە ئەیانەوێ بمان گەڕێننەوە ژیانی حەیوانی. حەیوان فەوزای قبوڵ نییە!

لە جێگەی موسوڵمانان، لە شاری موسوڵمانان، لەژێر حوكمی موسوڵمانان، شوێنێك حاجیو مەلای لێیە، لە شوێنێك ئەوقافی لێیە، ئەوجا جەریدەیەك، وەڵڵاهی ناوەكەشی ناهێنم، چونكی با قیمەتی نەدەمێ...جەریدەیەكیان بۆ دەرچووە، ئەو جەریدەیە یەك ئیشی هەیە، تەنها جوێن دانە بە خوا، بە پێغەمبەر، جوێن دانە بە هەموو ڕەوتە كوردییەكان. دەڵێن هەمووتان بێشەرەفن، دەڵێن بامارەیی نەمێنێ، با لەگەڵ پیاوێكی تردا ڕابوێرێ، باهەموو تێكەڵی یەكبن، زینا نەمێنێ، داوای ئەوە دەكەن. دەیانەوێ ئێمەش وەكی خۆیان بەرەڵابكەن.

وەختێ ئافرەتێكی فاسیدە، زیناكەر لەهەر كۆڵانێك هەبوایە، بەهۆیهاو چەپڵە دەریان ئەكرد، ئەیان ووت كۆڵانەكەمان پیس بوو.

بەڵام ئێستا وا بۆخۆیان ئەو نەوعە قسانە ئەكەنو، جەریدەشیان هەیە. ئەیانەوێ ئەو هەموو خەڵكەش بگەڕێننەوە لای خۆیان.



جابزانە تەئسیری موسوڵمانان چەندە؟! بزانە تەئسیری كاربەدەستان چەندە، كە ئەو حوڕییەتەی داوەپێیان؟!

ئەوە ئازادی، ئەوە سەربەستییە جوێن بەخوا ئەدەن، چونكە ئەزانن موسوڵمانەكان حەقیان بەسەر خواوەنییە...

خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ، ئادەم وحەوام خەڵق كردووە.. ئەڵێن ئەوە درۆیە! ئەڵێن خورافاتەو درۆیە، كەلە قورئان ئەفەرموێ بەهەشتم بۆتان ئامادە كردووە.. ئەڵێن درۆیە! ئەها..ئەڵێن بەهەشتی درۆینەی ئیسلام..بوختان بەسەر حەوا ئەكەنو..ئەڵێن حەوا مادام حەزت لە ئارەزوی جنسییە، من داوا ئەكەم خۆتو كچەكانت، لەكاتی منداڵبووندا ئازارت هەبێ!

لەجیاتی ئەوەی بڵێ لەو ئایەتە قورئان وا دەڵێ، دەڵێن قورئانی خورافات، لەوخورافاتە وادەڵێ!...

ئەمانە خۆیان ئەڵێن كافرین، چونكە ئەڵێن ئەو موسوڵمانانە شەریعەتەكەیان وا دەڵێ...

ئیهانەی هەمووتان ئەكەن، چونكە ئەڵێن ئیسلامییەكان ڕۆژەی پێنج جار ئەچنە مزگەوت ئیجتیماعی حیزبی ئەكەن.

ئەڵێن كچە مەلاو كچە شێخ، كچەكانیان بوونەتە ئەلمۆدەو... ئەوە ئیهانەی شێخو مەلا ئەكەن...

ئەمانە نە كوردن.. نە ئیسلامن.. نە حەیوانن.. حەیوان نین ...

ئیسلام خودا ساحێبێتی.. بەحریش بەدەمی سەگ پیس نابێ. بەڵام ئێمە خەمی موسوڵمانانمانە،خەمی غیرەتی موسوڵمانانمانە.. خەمی ئەوەمانە دەسەڵاتدارەكان چۆن مەجال ئەدەن بێ حەیاو بێ ئابڕوی ئاوها، لەناو میللەتی موسوڵمان، ناماقوڵی ئاوها بكەن! (سەلمان ڕوشدی) بەستەزمان ووتی هەندێك لە ئایەتەكان غەڵەتە، نەك هەمووی! ئەوان ئەڵێن هەمووی غەڵەتە! خوا نییە! جوێن بە خوا ئەدەن! ئەو وای نەكرد، هەموو عالەم ووتی ئەبێ بكوژرێ!

ئیسلام خاوەنی خۆی هەیە, ئـەما ئێمـە ئـەبێ غیرەتمـان هـەبێ, دیفـاع لـە پێغەمبـەر بکەین!..کە جوێن بە پێغەمبەر ئەدرێ لەڕۆژی قیامەت پێغەمبەر لێت ئەپرسێ:جوێنم پێ درا.. بۆ دیفاعت نەکرد؟

بەڵام ئەگەر بێغیرەت بن, خوا عیقابتان ئەدا.. جا موستەحەقی ئەو عیقابەن.

جوابتان چی‌یە لە ڕۆژی قیامەت, کە خوای گەورە پێت ئەڵێ:جوێنم پـێدرا بـۆ دیفاعـت نەکرد؟

مەوقیفتان چی‌یە مەلاکان؟ مەوقیفتان چی‌یە عالەمەکە, موسوڵمانان؟

ئەوانە جوێن بەخواو پێغەمبەر ئەدەن.. ئەدی کوا دەنگتان؟

ئەی ئەوانەی کە غیرەتی دینتان لە دڵدایە, نـەهی لـە خراپـە ئەکـەن, دیفـاع لـە خـواو پێغەمبەر ئەکـەن... یـانیش ئەوەیـە خـوای گـەورە عیقـابو عـەزابی گـەورەتان دێنێتـە سەر...ئەوجا چەندە داوا بکەن خوای گەورە, دوعاتان قبووڵ ناکات!

هیوادارین مەوقفێکی مووەحەد هەبێ, بەرامبەر ئەو بێ ئابڕووانە!

❊

**ڕوونکردنەوەیەکی (پارتی دیموکراتی کوردستان), لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە, کەلە ژمارە (132)ی ڕۆژی پێنج شەمەی 20|10|1997ز (هەرێمی کوردستان), بڵاو کراوەتەوە:**

ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی

ژمارە(20)ی بڵاوکراوەی (یەکسانی)

سەرچاوەیەکی وەزارەتی ڕۆشنبیری ڕایگەیاند:

ڕۆژنامەی (یەکسـانی), کەچـەند دانەیـەکی لـە هـەولێر بڵاوبۆتـەوە, لـە ژمـارە (20)ی ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی 1997دا, سووکایەتی بەبیروڕای پیرۆزی ئیسلام کردووە.



ڕۆژنامەکە (یا بڵاوکراوەکە_وەکو خۆی دەنووسێت) لە وتارێکدا لە ژێر ناونیشانی (ڕوانین ورەفتاری ئیسلام لە بەرامبەر مەسەلەی ژنان)دا, لە چەند ڕستەدا سووکایەتی ئاشکرای بـە ئایینی پیرۆزی ئیسلامو ناوی پەیامبەری ئیسلام(د.خ) کردووە.

ئەو جۆرە بۆچوونانە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێت لە گەڵ دابو نەریتی نیشتیمانپەروەریو ڕۆژنامەگەریو, پێچەوانەی یاسای ژمارە (10)ی چاپەمەنی هەرێمی کوردستانی عیراقە.

وەزارەتی ڕۆشنبیری ناڕەزاییی‌و بێزاری توندی خۆی بەرامبەر ئـەم جـۆرە یاساشـکێنیانە دەردەبڕێتو لە هەمان کاتدا ڕوونی دەکاتەوە کە (یەکسانی) لەم وەزارەتە مۆڵەتی دەرچوونی وەرنەگرتووەو, لە چاپخانە ناسراوەکانی هەولێر لە چاپ نەدراوە, بەڵکو لـە شـارێکی دیکـە دەرچووە کەدەسەڵاتی ئەم وەزارەتەی بەسەرەوە نیە.

وەزارەتی ڕۆشنبیری جـارێکی تـر ئومێـدەواری دەردەبڕێـت کەڕۆژنامـەو گۆڤـارو گشـت چاپکراوەکانی دەرچووی هەرێمی کوردستانی عیراق پابەندی یاسای چاپەمەنیو ڕێزلێنان لـە ئایینو مەزهەبو دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکان بن.

❊

**ڕیپۆرتاژێك لە ژمارە (169)ی 11|4|1998ی گۆڤاری (گوڵان)ی سەربە (پارتی دیموکراتی کوردستان), سەبارەت بە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ (سەلوا عەلی و نازەنین عەلی) هەڵسوڕاوانی (ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان) و (مەلا بەشیر)**

مەلا بەشیرو ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان کێ کێ دادگایی دەکات؟!

فتوادارانی تیرۆری ژنان دەبێ ڕیسواو مەحکوم بکرێن (( لە ژێر ئـەم ناونیشـانە ڕێکخـراوی سەربەخۆی ئافرەتان _ لقی هەولێر لە 1998/3/29 بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە تێیدا دەڵـێ مەلا بەشیر لە یەکێك لە خوتبەکانی ڕۆژانی هەینی قسەی بە شێوەی ناوزڕاندن بە ڕێکخراوی ناوبراو داوەو بە مەبەستی سـووکایەتی‌کردن بـەو ڕێکخـراوە, هـەروەها لـە بەیاننامەکـەدا

هاتووە کەوا پارێزگاری لە (قانوونی ئەحوالی شەخسی) پێش ڕاپەڕینی کردووەو بە پیرۆزی داناوە کە قابیلی دەسکاری نی‌یە, دەیەوێ بە ڕێگەی جولاّندنی هەستو سۆزی گوێگرەکانی فتوای کوشتنی ئەو ڕێکخراوە دەربکات, هەروەها دەڵێ دەبێ لە سەلمان ڕوشدی خراپتریان بەسەر بێت, کە مەلا بەشیر هەوڵەکانی بێهودە دەبێت گوێگرەکانی مل بەم تاوانە نادەن ڕوو دەکاتە ئەوانیشو ئیهانەیان دەکاتو بە بێغیرەتو خوانەناس ناویان دەبات هەروەك لە بەیاننامەکەدا هاتووە.

ئێمە لە گولاّن بە مەبەستی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی بابەتەکە ئەم لێکۆڵینەوەیەمان ئەنجامدا.

دوابەدوای گوێگرتنمان لە خوتبەی مەلا بەشیر سەردانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانمان کرد بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە چاومان بە سەلوا عەلی ئەندامی دەستەی بالاّی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانو لێپرسراوی لیژنەی پەیوەندی‌یەکان کەوت.

گولاّن: لە بەیاننامەکەتاندا هاتووە کەوا مەلا بەشیر لە خوتبەکەیدا ویستوویەتی بە ڕێگەی جۆشدانی گوێگرانی فتوای کوشتنی ئەندامانی ڕێکخراوەکەتان بدات. لە هەمان کاتدا مەلا بەشیر ئێوە تاوانبار دەکات بەوەی کە ئێوە لە ڕۆژنامەکەتاندا سووکایەتیتان بە موقەدەسات کردووەو زڕاندووتانە, ئێوە چی دەڵێن؟

بەڕێز سەلوا عەلی: ڕۆژنامەی ئێمە چوار ساڵە دەردەچێ بە شێوەیەکی یاسایی‌و بایەخی تایبەتی بە بابەتەکانی پەیوەندار بە ئافرەتان دەدات, واتە بایەخ دەدات بە کێشەکانی ئافرەتان لە ڕووی کۆمەلاّیەتی‌و یاسایی‌یەوە, هەروەها چارەسەریشیان بۆ دادەنێ. سەبارەت بەو بابەتەی مەلا بەشیر باسی دەکات ووتارێکە بە ناوی (ڕوانینو ڕەفتاری ئیسلام بەرامبەر بە مەسەلەی ژنان) کە لە ژمارە 20ی یەکسانی‌دا بلاّوبووەتەوە, بەلاّم ئەو ووتارە ناوی نووسەری لەسەرە واتە نووسەر لێی بەرپرسیارە, ئەگەر ئیمزای نووسەری پێوە نەبوایە ئەوە ڕۆژنامەکەمان لێی بەرپرسیار دەبوو لە هەموو شتێك.

گولاّن: ئەو قسەیەی بەڕێزت وادەگەیەنێ ووتارەکە ڕاوبۆچوونی ڕێکخراوەکەتان نی‌یە؟



بەڕێز سەلوا عەلی: ئەو ووتارە لایەنێکی واقعی تێدایە کە لەگەڵ بۆچوونی ڕێکخراوەکەمان یەك دەگرێتەوە, بۆ نموونە ئەو ووتارە باس لە (قانوونی ئەحوالی شەخسی) دەکات, باس لە گۆڕینی (قانوونی ئەحوالی شەخسی) دەکات کە چۆن بگۆڕدرێو بەدیلی بۆ دابنرێ ئەمەش یەکێکە لە ئامانجە سەرەکی‌یەکانی ڕێکخراوەکەمان.

گولاّن: بێگومان مەبەست لەهەر شۆڕشێك یاخود لەهەر ڕاپەڕینێك گۆڕینی هەندێك یاسایە کە کار دەکاتە سەر ئازادی‌یەکان یاخود پابەندە بە ئازادی‌یەکان ئەو ئازادی‌یانەش لە یاساکانی(ئەحوالی شەخسی)و یاساکانی تایبەت بە ئازادی‌یەکان بەدی دەکرێن, دوای ڕاپەڕینیش لە کوردستان سیستەمێکی سیاسی نوێ هاتە ئاراوە ئەویش سیستەمی دیموکراسیەتە, بەپێی ئەم سیستەمە زۆر یاسای نوێ داڕێژران, لەوانە ئازادی بیروڕا دەربڕینو ئایینو... تد.

ئێوە لەو ڕوانگەیەوە چۆن دەڕواننە خوتبەکەی مەلا بەشیر بەتایبەتی ئێوە تاوانباری دەکەن بەوەی کەوا بەرگری لە یاساکانی (ئەحوالی شەخسی) پێش ڕاپەڕین دەکات؟

بەڕێز سەلوا عەلی: بەڵێ ڕاستە یەکێك لە بڕیارو یاساکانی پەرلەمانی کوردستان ئازادی بیروڕایە, ئازادی ئایینە, ئێمەش هەر لەو ڕوانگەیەوە زۆر بە ڕاشکاوی ڕای خۆمان دەردەبڕین ووتار بلاّودەکەینەوە بەرانبەر بە مەسەلەکان, بەلاّم دەمەوێ بڵێم سەبارەت بە یاسای (ئەحوالی شەخسی) هەمان یاسای پێش ڕاپەڕینە ئێمەش ئەو یاسایەمان پێ ڕەوا نی‌یە, چونکە ئەم یاسایە تەنیا سەرچاوەی شەرعیەتی ئیسلامە, یاسایەکە ژنان بە پلە دوو دادەنێ, ووتارەکەش کە باس لەم بابەتە دەکات لەگەڵ بۆچوونی ڕێکخراوەکەمان دەگونجێ, مەسەلەیەك نی‌یە ئیمزای نووسەری پێوەیە, بەلاّم بۆیە بلاّومان کردۆتەوە, چونکە لەگەڵ بۆچوونی ئێمەدا دەگونجێ.

ئێمە کە ئەم شتەمان بلاّوکردۆتەوە, ڕوانینێکی عیلمیانەیەو, ئەگەر بەڕێز مەلا بەشیر بیەوێت وەلاّمی ئێمە بداتەوە زۆر مینبەری دیکە هەیە کە دەیتوانی لەوێ وەلاّمان بداتەوە بەتایبەتی لەڕێگەی ڕۆژنامەکان, بەلاّم نەك بە شێوازی ناوزڕاندنو ئیهانەکردنو سوکایەتی پێکردنو حەزناکەم لێرەدا دووبارەیان بکەمەوە.

گولاَن: له بەياننامەكەتاندا هاتووە كەوا بەرێز مەلا بەشير بە ڕێگەی بەجۆشدانی جەماوەر فتوای كوشتنی ئەندامانی ئێوەی داوە, ڕاستە بەرێز مەلا بەشير دەڵێت لەچاو ئێوە سەلمان ڕوشدی هیچی نەكردووە, بەلاَم فتوای ڕاستەوخۆو بەئاشكرای نەداوە كە بڵێ دەبێ بكوژرێن ئایا ئێوە لە ڕووی ناوەڕۆكەوە دەڕواننە قسەكانی مەلا بەشير كەوا فتوایە؟

بەرێز سەلوا عەلی: ڕاستە فتواكە بە ئاشكرا نەدراوەو نەیگوتووە ئەمانە دەبێ بكوژرێن, بەلاَم سەيری هەر ووشەيەك لە ووشەكانی بكەيت هەر لە سەرەتای خوتبەكەيەوە دەبينی ئەمە دەگرێتە خۆی, هەوڵ دەدات هەستی ئەو خەڵكە كە لەوێ دانيشتووە ببزوێنێ, پێيان دەڵێ: ئێوە بێغیرەتن, ئێوە بێشەرەفن, ئێوە ئەگەر بێغیرەت نەبن ناهێڵن كۆمەڵە ئافرەتێكی وا... لەناو كۆمەڵگەی ئێوەدا ئە بەو جۆرە باس دەكات. ئەمە خۆی لە خۆيدا فتوايە. شتێكی ديكەش كە دەڵێ سەلمان ڕوشدی هيچی نەكردبوو هەموو عالەم گووتی بكوژرێ, هەروەها بە ((سەريحی عيبارە)) دەڵێ بكوژرێ, كەچی ئەمانە خراپتريان كردووە, ئەی باشە ئەمە چ دەگەيەنێ ئەگەر ئەمە فتوا نەبێ ئايا بەڕای ئێوە چ واتا دەگەيەنێ.

گولاَن: باشە بەڕای ئێوە بەرێز مەلا بەشير لە چ سەرچاوەيەكی هێزەوە ئەم فتوايەی داوە, ئێمە لە ووڵاتێكين حكومەتی هەيەو ياسای خۆی هەيەو دەبێ لە ڕێگەی دادگاكانەوە چارەسەری كێشەكان بكرێت, باشە ئەو فتوايەی بەرێز مەلا بەشير لە چ سەرچاوەيەكی ياسايی وەرگيراوە؟

بەرێز سەلوا عەلی: ئێمەش دەڵێين با ياسا دەست بالاَ بێت لە كۆمەڵگەدا نەك خەڵكانی ديكە. يان هەركەسێك بێتو لە خۆيەوە فتوا بداتو ئەم فتوايە ببێتە ياسا لە كۆمەڵگەدا, بەلاَم بەداخەوە لە كۆمەگەی ئێمەدا هەزاران جۆرە فتوا دەردەكرێ نە تەنيا بۆ ڕێكخراو, بەڵكو بۆ هەنديك كەسايەتيش, بۆ نموونە (كەژاڵ خدر) لە سلێمانی يەكێكی ئەوها فتوای بۆ دەركرد كە لووتی ببڕدرێتو بكوژرێ ئيدی ئەمە نموونەيەكو چەندين نموونەی ديكەش هەيە فتوای لەسەر دەدرێو فتواكەش جێبەجێ دەكرێ. ئەمەش سنوور شكاندنی ياسايە, چونكە فتوادادان شتێكی زۆر ناشارستانیيەو لە هەموو عورفو عادەتێكا بەدەرە كە سيمای شارستانيەت بە كۆمەڵگەوە نامێنێت.



گولاَن: بەڕای ئێوە چۆن چارەسەری ئەم كێشانە دەكرێن؟

بەرێز سەلوا عەلی: ئێمە لە ڕێكخراوی خۆماندا لەگەڵ ئازادی بێقەيدو شەرتی سياسين, واتە هەركەسێك ئازاد بێ لە دەربڕينی بيروڕای خۆی با ياسا نەهێڵێ بيروڕايەك بسەپێنرێ بەسەر بيروڕايكی ديكەو با ياسا سەروەر بێتو ڕێگە نەدات ئەو جۆرە فتوايانە بەردەوام بێت لە كۆمەڵگەدا بۆ ئەوەی ئەم جۆرە پاشا گەردانيە تەشەنە نەسێنێت.

هەروەها چاومان كەوت بە بەرێز مەلا بەشير بەم چەشنە باسی لە ڕووداوەكە كرد:

گولاَن: ئەوان دەڵێن بەرێز مەلا بەشير فتوای كوشتنی ئەندامانی ئەو ڕێكخراوەی داوە؟ شتی وا هەيە؟

بەرێز مەلا بەشير: ئێمە لايەنێكی قەزائی نين كە فتوای حوكم دەربێنين بۆ كەسێك, ئەوە كاری دادگەو قازیو حاكمە كە بە گوێرەی كاری ياسايی خۆيان حوكم دەدەن, ئێمە تەنها ئەركمان ئەوەيە كە لەسەر مينبەری مزگەوتدا لە شوێنی پێغەمبەر(د.خ) ڕاستی بۆ خەڵك بە ديار بخەين, جا قسەكانی ئێمە قورئانو سوونەتە, جا كەسانێك ئەگەر قورئانو سوونەتيان لاپەسەند نەبێت كەواتە دوژمنايەتیيان لەگەڵ ئێمەدا نیيە وەكو كەسێك, بەڵكو دوژمنايەتیيان لەگەڵ ئيسلامە.

بۆيە ئێمە نە ئێستەو نە لە پێشوو نە لە ئايندەدا ئەمە بە كاری خۆمان نازانينو ئەمە كاری ئێمە نیيە.

گولاَن: ئەوان دەڵێن سوكايەتيت بە ڕێكخراوەكە كرووەو سوكايەتيت بە ئەندامانی ڕێكخراوەكە لە خوتبەكەتدا كردووە.

بەرێز مەلا بەشير: كامە خوتبە؟ نازانم باسی كام خوتبە دەكەن... ؟

گولاَن: خوتبەيەكت داوە.

بەرێز مەلا بەشير: باشە بۆ ئێستە وەلاَمەكەی دەدرێتەوە؟ بۆ ئەوكات وەلاَم نەدەدرايەوە؟

گولاَن: ئيدی ئێستە وەلاَمەكەی هەيەو ئێمە گوێبيستی خوتبەكە بووينو يەكێك لە ڕستەكانی جەنابت لەو خوتبەيەدا دەڵێی: سەلمان ڕوشدی هيچی نەكردووە تەنيا ووتويەتی

چەند ئایەتێك هەڵەی تێدایە یاخود کەم‌وکوڕی هەیە, بەڵام ئەمانە تاوانیان زۆر گەورەترە, ئەوانیش ئەمە بە فتوایەکی ناوەکی دادەنێن بۆ کوشتنی ئەندامانی ڕێکخراوەکەیان.

بەڕێز مەلا بەشیر: نەخێر ئەمە فەتوا نیە دووەمیش ئەم بابەتە بۆ ئێستە وەڵام دەدرێتەوە؟ مانگی دوانزە ماوەیەکی زۆرە هەر لەبیرم نەماوە, ئەگەر ئەو خوتبەیە بێت کەوەڵامی چەند پەلامارێکی ئەوان بوو لە ڕۆژنامەی یەکسانیدا بلاویان کردبوەوە.

گوڵان: بەڵێ وتارێکە کە لەو ڕۆژنامەیە دابەزیوە وەکو خۆیان دەڵێن ئیمزای نووسەری لەسەرە؟

بەڕێزمەلا بەشیر: ئەو خوتبەیە وەڵامی قسەکانی ئەوان بوو لەو ڕۆژنامەیەدا, نەك تەنیا ئەوە وەڵامی ئەو وتارە بووە,بەڵکوهەموو وتارەکانی ڕۆژنامەکەیە لەو ژمارەو لەهەموو ژمارەکانی دیکە کە هیچیان تێدا نیە, تەنیا سوکایەتی‌کردن بە موسڵمانان نەبێت.

ئێستە من لە بیرم نەماوە, بەڵام بێگومان لە خوتبەکە وەڵامیان دراوەتەوە.

گوڵان: باشە جەنابت جنێوت بەوان داو ناوت زراندوون...؟

بەڕێز مەلا بەشیر: نەخێر, ناوی کەس نەهاتووە, بەڵام لەوانەیە ناوی ڕۆژنامەکە هاتووە کەوا لەو ڕۆژنامەیە ئەو شتانە هاتووەو ئەمەش وەڵامەکەیەتی.

گوڵان: لە بەیان نامەکەیاندا هاتووە کەوا تۆ بەرگری لەیاسای (ئەحوالی شەخسی) پێش ڕاپەڕین دەکەیت‌و ئێوە ڕەچاوی ژیانی دوای ڕاپەڕینتان نەکردووە کە هەندێ شتی نوێی تێدایە؟

بەڕێز مەلا بەشیر: جا واقیع‌و کردەوەو ئەنجامی کردەوەکان دووپات دەکاتەوە ئاخۆ کێ خزمەتی ڕژێم دەکات‌و کێ دەیەوێ ئەو شتانە بۆ خزمەتی ڕژێم ڕابکێشێ. ئەوان کە ئەو جۆرە شتانە بلاودەکەنەوە ئەوجۆرە نا ئارامیانە لەناوخەڵکدا دروست دەکەن یان ئێمە کەباسی قورئان بۆ خەڵك دەکەین, ئێمە هیچ کاتێ: ناوی یاسای ڕژێممان نەهێناوە ناوی یاسای بەغدامان نەهێناوەو تەحەداشیان دەکەین ئەگەر ناویشمان هێنابێ ناوی قانوونی خوامان هێناوە, بۆ نموونە یاسای فرە ژنی, ئەم یاسایە یاسای بەغدا نییە, یاسای منیش نییە لە گیرفانی خۆمم دەرهێنابێ.



گوڵان: لە کۆمەڵگەی شارستانیدا یاسا سەروەرە یاسا ڕۆڵ دەبینێ نەك هەڵسەنگاندنی چەند کەسانێك جا حکومەت ڕەچاوی شەریعەت دەکات.. ناکات لە یاساکانیدا ئەمە شتێکی دیکەیە بەڵام سەروەری بۆ یاسایەو ئەوان دەڵێن بەڕێزتان لەو یاسایە دەرچووی.

بەڕێز مەلا بەشیر: کام یاسا؟! ئەو یاسایە کە هەیە لە حکومەتی هەرێم کە دەڵێ دەبێ ئازادی بیرورا هەبێت‌و ڕێز لە بیرو بۆچوون‌و ئایین‌و ڕێچکەکان بگرێت؟

بەڕێز مەلا بەشیر: جا ئەگەر ئازادی بیرورا هەیە با ئێمەش ئازادی بیرورامان هەبێت, بۆ بۆوان هەیە بە ئازادی لە بیروڕادا جنێو بدەن, بۆ بۆ ئێمە نییە وەڵامیان بدەینەوە؟

گوڵان: باشە واتە جەنابتان خەڵکتان هان نەداوە بۆ کوشتنی ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە؟

بەڕێز مەلا بەشیر: بۆ ئەوان لە مانگی دوانزەوە تاکو ئێستە کەسیان کوژراوە..؟ ئەگەر من لەوانە بوومایە کە خەڵك هان بدەم بۆ کوشتن چ عەقڵ‌و لۆجیکێك قبوولْ ناکات کەوا بە ئاشکرا لە خوتبە هاوار بکەم, ئەو شتە بە دزی دەکرێت.

گوڵان: یەکێك لە ڕستەکانی بەڕێزتان لە خوتبەکەدا هاتووە جەنابت دەڵێی ئەوانە نەك تەنها مرۆڤ نینە, بەڵکو لە ئاژەڵ کەمترن؟

بەڕێز مەلا بەشیر: دەزانی بۆ؟ چونکە کەسێك هەوڵ بدات شیرازەی کۆمەڵ تێك بدات‌و ڕەووشت نەمێنێ نێرو مێ ناموس لە نێوانیان نەمێنێ‌و نێرو مێ‌یاتی لە نێوان ئاژەڵیشدا هەیە کە قبوولْ ناکات نێر لەگەڵ نێر کۆ ببێتەوە. بەڵام ئەمانە داوای ئەمە دەکەن! وا شتەکان ئاوا هاتووە؟

گوڵان: ئایا لە ڕۆژنامەکەیاندا هاتووە؟ بەڕاستی داوای شتێکی وایان کردووە؟!

بەڕێز مەلا بەشیر: ئەگەر تەماشای ئەو ژمارەی یەکسانی بکەی کە خوتبەکە وەڵامی دەداتەوە, باسی ئایەتی مارەیی دەکەن. ڕۆژنامەکە دەڵێ ناموس نابێ بمێنێ واتە شتەکە زیادە لە ناو کۆمەڵ, واتە بۆ مێردایەتی بمێنێ؟ بۆیە ئێمە ئەو وەڵامەمان داوەتەوە.

گوڵان: ئایا ئەوان داوای ئەوەیان کردووە جیاوازی نێوان دایك‌و ژن نەبێ؟!

بەڕێز مەلا بەشیر: ڕۆژنامەکەیان بخوێنەرەوە.

گوڵان: ئەی کە دەڵێی سەلمان ڕوشدی هیچی نەکردووە؟

بەڕێز مەلا بەشیر: مەبەست لەوە کوشتن نی‌یە.

گوڵاڵ: بەڵام ئەوان ئەمە بە مانای زمنی کوشتنی تێدەگەن!

بەڕێز مەلا بەشیر: ئاخر بۆ ئەوەندە وا دەکەن, ئەمە مانای زمنی نی‌یە, مانای قسەکە سەلمان ڕوشدی گومانی لە چەند ئایەتێك هەبوو نەك هەموو قورئان, باوەڕی بە قورئان هەبوو, دەیگووت زۆربەی قورئانەکە ڕاستە, بەڵام چەند ئایەتێك نا. بۆیە پەرتووکەکەش ناوبرا (ئایاتی شەیتانی) کەوابوو سەلمان ڕوشدی باوەڕی بە خواو قورئان هەیە, من گوتوومە سەلمان ڕوشدی هیچی نەکرووە دونیای بۆ هەڵسا.

گوڵاڵ: کەواتە دونیا بۆ ئەوە هەڵسا کە هیچی نەکردووە, بەڵام ئەمانە زۆرتریان کردووەو دەبێ پتر بۆیان هەڵسن ئەوان بەم شێوەیەی تێدەگەن, شتێکی دیکەش لە ڕستەیەکی دیکەدا هاتووەو دەڵێ(( ڕۆژی قیامەت خوا لێتان دەپرسێ بۆ بەرگریتان نەکرد..؟)) تۆ چی پێ دەڵێی؟! بەڕێزت پێیان دەڵێیت ئێوە بێغیرەتن دیفاعتان نەکردووە, ئەوان ئەمەش بە هەڕەشەو هاندان دادەنێن بۆ کوشتنیان.

بەڕێز مەلا بەشیر: جا ئەوان کەیفی خۆیانە, چۆنی لێکدەدەنەوە با لێکی بدەنەوە, ئێمە نامانەوێ وەڵامیان بدەینەوە, چونکە مەبەستی ئەوان ئەوەندەیە کە ناوی ڕێکخراوەکەیان لەسەر بڵندگۆکان باس بکرێ تا خەڵك بزانێ ئەوان هەنو دەیانەوێ پتر ناویان بێنین. ناویشیان لەوێ بە ئاشکرا نەهاتووەو فتوای کوشتنی ئەندامەکانیشیان نەدراوەو بە هیچ شێوەیەك. کە دیموکراتیەت هەیە, با ئەوان هەر بڵێن بەڵام ئێمەش بۆمان هەیە وەڵامیان بدەینەوە, ئێمە پەیوەندیمان بە مەسەلەی کوشتن نی‌یە, بەڵام ئەمە داب‌ونەریتێکی کوردەواری کۆنە ئافرەتێك ئەگەر بێئابڕووبێ لەوانەیە برایەکەی بیکوژێ, ئەم داب‌ونەریتەش واتە میللەتەکەی ئێمە بە ئەخلاقەو حەز دەکات هەموو شتێك بە خاوێنی بێت.

من لەناو مەلایەکانیش بەناوبانگم کە زۆر بەرگری لە ئافرەتان دەکەم تەنانەت پیاوان گلەییمان لێدەکەنو دەڵێن ئافرەتتان لە ئێمە هار کردووە ئەوەندە پێیان هەڵدەدەن, ئێمە پتر لە بیست کاسێتمان هەیە لەسەر کچ نابێت بە زۆر بە مێرد بدرێتو شیربایی‌و بنپشكو ژن بەژنی‌و ئەمانەمان هەموو ڕەت کردووەتەوە.



ئێمە مەبەستمان ڕەتدانەوە نی‌یە, چونکە خۆمان بە تاوانبار نازانین, بەڵکو ئەوان لەوانەیە بیانەوێ شەڕمان پێ بفرۆشنو ئەوەی لە بەیاننامەکەیاندا هاتووە هەمووی ڕەت دەکەینەوە.

فتوای کوشتنی کەسمان نەداوەو ناشدەین, ئەگەر وەڵامی ڕۆژنامەیەکمان دابێتەوە ئەوە لە ڕوانگەی قورئانەوەیە هیچ شتێکمان لە گیرفانی خۆمان دەرنەهێناوەو بەرگری لە یاسای (ئەحوالی شەخسی) ناکەین, بەڵکو بەرگری لە ئایەتی قورئان دەکەینو ئەگەر لە هەر خوتبەیەك شتێکمان دژی ئایین گوتووبێ ئامادەین دادگەیی بکرێین, بەڵام دژی ڕای ئەمو ئەو بێت ئەمە هەر دەبێت.

گوڵاڵ: ئەی یاسا ؟!

بەڕێز مەلا بەشیر: تەنانەت ئەگەر یاساش دژی قورئان بێت ئێمە ئەرکمانە بڵێین قورئان وا دەڵێ, یاسا موخالیفە لەگەڵ قورئان, ئەمە ئەرکمانە, ئەی ئێمە ئەرکمان چی‌یە؟ ئەمە یەك, دووەم داوامان لە دەزگاکانی هەرێم هەیە ئەگەرچی ئازادیدەربڕین هەیە, بەڵام سنوورێك بۆ ئەوە دابنرێ کە نەبێتە مەسەلەی کەمکردنەوەی کەرامەتی مرۆڤ, بەشێوەیەك مرۆڤ ئازادە کە سووکایەتی بە بەرانبەری نەکات.

داواش دەکەم دەزگاکانی پەیوەندیدار لەم شتە بکۆڵنەوە ئەگەر وانی‌یە من داوا دەکەم کە سزا بدرێن بۆئەوەی جارێکی دیکە شتی وانەکەن.

گوڵاڵ: واتە لەگەڵ ئەوەی پەنا بردرێتە بەر دادگا بۆ ئەم مەسەلەیە؟

مەلا بەشیر: دادگەی شەرعی, من ئەگەر دادگایەکە شەرعی بێت, ڕازیم.

گوڵاڵ: دادگا ئەو دادگایانەن کە ئێستا هەن؟

بەڕێز مەلا بەشیر: بەڵێ ئەو دادگایانەی کە هەنەو ڕازیم, چونکە زۆر لە یاساکانیان شەرعینو پەیڕەوی قورئان دەکەن, چونکە ئایینی دەوڵەت بە ڕەسمی ئیسلامە.

هەروەها پاش چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز مەلا بەشیر چەند پرسیارێکی دیکە سەری هەڵدا, جارێکی دیکە سەردانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانمان کردەوەو چەند پرسیارێکمان ئاراستەی بەڕێز نازەنین عەلی بەرپرسی لقی هەولێری ڕێکخراوەکە کرد.

گوڵان: خوتبەکەی بەڕێز مەلا بەشیر لە مانگی دوانزەدا دراوە کەچی ئەو بەیاننامەی ئێوە لە (29 )ی مانگی ئاداردا دەرچووە, باشە بۆ ئەو ماوەیە درێژە لە وەڵامدانەوە بێدەنگ بوون؟

بەڕێز نازەنین عەلی: بەڕاستی ئێمە لە کاتی خۆیدا ئاگاداری ئەو خوتبەیە نەبووین, بەڵام لەم دواییەدا سووکایەتییەکی زۆر بە ئافرەتان کراو ئێمە ویستمان سەرچاوەکەی بزانین, وەکو ئەوەی بەڕێز مەلایەکی کوران دەڵێ: ( ژنانی سفوور وەکو تاکسینەو بۆ هەموو خەڵکن‌و ژنە پێچەدارەکان وەکو ئۆتۆمبێلی تایبەتین تەنیا بۆ خاوەنەکانیانن), ئێمە لە دوای ئەو لێکۆڵینەوانە بووین کاسێتەکەی بەڕێز مەلا بەشیرمان بە دەستکەوت کە گوێبیست بووین قسەکانی دژی ئێمە بوو ئەوسا ئێمە زانیمان‌و بەیاننامەکمان دەرکرد.

گوڵان: بەڕێز مەلا بەشیر دەڵێ من فتوام نەداوە ئێوە چی دەڵێن.

بەڕێز نازەنین عەلی: قسەکانی ڕوون‌و ئاشکرایەو نموونە هێنانەوەی سەلمان ڕوشدیش بەڵگەیە.

گوڵان: وەکو خۆی دەڵێ تاکو ئێستە کەس لە ئەندامەکانی ئێوە نەکوژراوە.

بەڕێز نازەنین عەلی: ئەم بیانووە ڕاست نییە, چونکە ئەوەتە فتوای کوشتنی ڕێبوار ئەحمەدو تەسلیمە نەسرین دراوە.

بەڵام تاکو ئێستە هیچ کەسیان نەکوژراوون ئەمە ئەوە دەرناخات کە فتواکە نەدرابێت.

گوڵان: بەڕێز مەلا بەشیر دەڵێ ئێوە جیاوازی لە نێوان ژن‌و دایك‌و نێرو مێ ناکەن‌و جۆرە بەرەڵاییەك هەیە لە هزرتان‌و دەتانەوێ جۆرە بەرەڵاییەك هەبێت لە ڕەفتارتان دەتانەوێ جیاوازی نەبێت لە نێوان نێرو مێ لە مومارەسەی سێکسدا (نێرو نێر, مێو مێ) ئایا ئەمە ڕاستە؟

بەڕێز نازەنین عەلی: ئەمانە قسەی بۆشن, ئەوان کە ناتوانن وەڵامـان بدەنەوە ناچار پەنا دەبەنە بەر هەڵبەستنی ئەم شتانەو جنێودان‌و ئەمە بەشێکە لە شێوازی زەبوونانەی ئەوان.



هەرکەسێکیش ڕۆژنامەو بەرنامەی ئێمەی خوێندبێتەوە دەزانێت ئێمە تا چ ڕادەیەك بەرگری لە بەرزترین پرەنسیپەکانی مرۆڤایەتی دەکەین, ئێمە دەڵێین ژنانیش وەکو پیاوان ئازادن لە هەڵبژاردنی هاوسەریان‌و لە کاروباری کەسایەتی خۆیان.

گوڵان: لە ڕووی یاساییەوە ئێوە چۆن تەماشای مەسەلەکە دەکەن.

بەڕێز نازەنین عەلی: بەڕێز مەلا بەشیر پێشێلی هەموو مەوازینێك‌و شێوازێکی مرۆڤایەتی کرووە, لە قسەکانیدا ناوی زڕاندووین‌و جنێوی ناشیرینی بە ئێمە داوە, کە من دەڵێم بواری قسەو گفتوگۆی تیادا نەماوەتەوە, بە ئێمە دەڵێت داوای شێوازێکی ئاژەڵی دەکەن لە ژیاندا بەڵام کە پیاوێك بخرێتە نێوان دوو ژن‌و ژن‌و سێ ژن‌و چوار ژنەوە, ئەوە بەلای ئێمە گەورەترین شێوازی ئاژەڵییە, نەك ئەوەی ئێمە دەیڵێین کە ئەو مرۆڤە چ ژنە, چ پیاو بە ئارەزووی خۆی ژیانی خۆی هەڵبژێرێت, بەڵێ ئێمە ڕازی نین کە شووکردنێك بە پاڵەپەستۆ بێت‌و ئێمە لەگەڵ ئەوەین ئەم ئافرەتە بە ئارەزووی خۆی شوو بکات بە ئارەزووی خۆی هاوسەری خۆی هەڵبژێرێ نەك بە پاڵەپەستۆ.

گوڵان: ئێوە بۆ پەناتان بردەبەر بەیاننامەو پەناتان نەبرد بۆ دادگا؟

بەڕێز نازەنین عەلی: ئێمە پەنا دەبەینە بەر دادگەو پەنا دەبەینەبەر بەیاننامەش بەڕای ئێمە دادگە بە تەنیا بەس نییە, چونکە لە سووچی خانوویەکدا ئەو قسانەی نەکرووە, بەڵکو لە پێش جەماوەرێکدا ئەو قسانەی کردووە بۆیە ئێمەش پەنا دەبەینەبەر شێوازی سیاسی خۆمان, لەلایەکی دیکەوە ئەوان وەکو شێوازێکی سیاسی کاسێتەکەیان زۆر دانەیان لەبەرگرتوەتەوەو لەناو خەڵکی خۆیاندا بڵاوکردووەتەوە, بۆیەش ئێمە پەنا دەبەینەبەر بەیاننامەو بەر دادگەش.

گوڵان: من پرسیارێکم ئاراستەی بەڕێز مەلا بەشیر کرد, ووتم ئامادەی مەسەلەکە لە دادگە چارەسەر بکرێت, ئەو ووتی بەڵێ.

بەڕێز نازەنین عەلی: ئێمەش ئامادەین.

گوڵان: ئێوە کامەن, داواکارن یان داوا لەسەر تۆمارکراو؟

سێ کەسیان بەیەکەوە هاتنە وەڵامو ووتیان: ئێمە داواکارینو داوا دژی بەڕێز مەلا بەشیر بەرز دەکەینەوە.

گوڵان: تاکو ئێستە ئەو داوایەتان لە دادگە بەرز نەکردووەتەوە.

بەڕێز نازەنین عەلی: دەیکەین.

*

## ڕوونکردنەوەیەکی ڕۆژنامەگەری:
## لە لقی هەولێری ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانەوە

خەڵکی ئازادیخوازی شاری هەولێر!

وەك ئاگادارن, ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان_لقی هەولێر_ لە بەرواری 29|3|1998دا بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە,

بەدوای بەدەست هێنانی کاسێتێکی دەنگ تۆمارکراوی مەلایەك بەناوی مەلا بەشیر, کە ماوەیەك بەر لە ئێستا لە خوتبەیەکی ڕۆژی جومعەدا, بە فەرهەنگو شێوازێکی دوور لە هەموو پرەنسیپێکی ئینسانی, دەکەوێتە سوکایەتی پێکردنو ئیهانەکردن بەڕێکخراوەکەمانو بڵاوکراوەی یەکسانیو ئەندامانمان, وە بە ئاشکرا بانگەوازو هاندانو تەحریزی خەڵك دەکات بۆ تیرۆرو کوشتنی ئەندامانی ڕێکخراوەکەمانو دەڵێ دەبێ لە سەلمان ڕوشدی خراپتریان لێبکەن.

هەروها لە بەرانبەر پێشڕەوییەکانی بزووتنەوەی یەکسانیخوازی ژنانو هاتنەمەیدانی بەرچاوی ئەم بزووتنەوەیە لە ماوەکانی 8ی مارسی ئەمساڵدا کە سەرنجی خەڵکی کودستانی بەکێش کرد بۆ لای کێشەکانی ژنان. چەند مەلایەکی کۆنەپەرست هێرش دەکەنە سەر شەخسیەتی ژنانو ئیهانەیان پێدەکەن, لە چەشنی مەلای مزگەوتی مەلا زاهیر لە گەڕەکی کوران کە شەوی 19\20|3|1998دا لە کاتی مناسەبەیەکی زەواجی ئیسلامیدا دەڵێ: ژنانی سفورو مۆدە وەك سەیارەی تەکسینەو ژنانی موحەجەبە وەك سەیارەی خسوسینە!



ئەوەبوو بەدوای بەیاننامەکەی ڕێکخراوو بیستنی خوتبەکەی مەلا بەشیر لەلایەن گۆڤاری گوڵانەوە لە ژمارە (169)دا دیمانەیەکی ئەنجام دا لەگەڵ ئەندامانی ڕێکخراوەکەمانو مەلا بەشیر. وە هەر لەو دیمانەیەدا بۆ جارێکیتر مەلای ناوبراو لە لاپەڕە 18 داو لە ستوونی سێهەم, بەناوی دابو نەریتی کوردەواریو بە بەهانەی نامووس پەرستی ڕەسمیەت دەدات بە کوشتنی ژنان. وە لەسەر داوای تەلەفزیۆنی گوڵان بۆ سازدانی منازەرەیەکی تەلەفزیۆنی لە بەرنامەی (ڕەهەند) کەشەوی 12\13|4 پەخش دەکرێ, لە نێوان ئێمەو مەلا بەشیر, ئێمە ئامادەیی خۆمان بۆ ئەو منازەرەیە نیشانداو ئەم جۆرە لە منازەرات بە ئوسلوبێکی شارستانی دەزانینو دیفاعی لێدەکەین. بەڵام دوواتر ئاگاداربووینەوە کە مەلا بەشیر پاشەکشێی کردووە لە ئامادە بوونو لەو منازەرەیە, چونکە دەزانێ قسەوباسو پەیامی ئینسانی ئێمەو ئەو بەرەو کوێ دەباتو پەردە لادەدات لەسەر ئەو زوڵمو ستەمەی کە لەسەر ژنانە. هەروەها بەر لە دووسەعات لە کاتی تۆمارکردنی ئەو منازەرەیە, تەلەفزیۆنی گوڵان ئێمەی ئاگادار کردەوە کە ئەو منازەرەیە بۆ کاتێکی نادیار دواخراوە.

ئێمە وەك ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان سەرەڕای ئەوەی بەشوێن ئەوەوە دەبین کەچیتر تەحقیرو ئیهانەت کردن بەژنان کۆتایی پێبهێنین, لەهەمان کاتیشدا بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نادەین, لەم کۆمەڵگایەدا کەسانێك بە ئارەزووی خۆیان بانگەوازی کوشتنو تیرۆری ژنان بدەنو تەبلیغاتی دژی ئینسانیو دژی ژنانو پەرە پێدەن بۆ جارێکی تر ڕایدەگەیەنین کە دەبێ هەموو ئەو کەسانەی کە بەم شێوازە هەڵدەستن دادگایی بکرێنو بە سزای توند بگەیەنرێن.

وە بانگەوازی تەواوی لایەنو ڕێکخراوەکانو هەموو ئەو کەسانەی کەلایەنگرو مدافعی پێشکەوتنو ئازادی ئینسانن کە توندترو بەهێزتر بێنە مەیدانو پشتیوانی لە هەڵوێستی ئینسانیانەو ڕادیکاڵانەی ئێمە بکەن, لە پێناو بنەبڕ کردنو دەست کۆتاکردنی تاوانو تاوانباران بەڕووی ژناندا.

سەرکەوتووبێت بزووتنەوەی یەکسانیخوازی ژنان!

بژی یەکسانی هەمەلایەنەی ژنانو پیاوان!

ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان

لقی هەولێر

1998|4|13

❊

**بۆ بەڕێز/ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران**

**بابەت/ یاداشتنامە**

پاش سڵاو

بەڕێزان...

چەند مانگ بەر لە ئێستا, مەلایەك بە ناوی مەلا بەشیر, لە شاری هەولێر, لە خوتبەیەکی ڕۆژی جومعەدا, بە شێوەیەکی هیستیریایانەو دوور لە هەموو پرەنسیپێکی ئینسانی ئەم سەردەمە, دەکەوێتە سوکایەتی پێکردنی ئەندامانو هەڵسوڕاوانی ڕێکخراوەکەمانو لە هەمان خوتبەدا, بە شێوەیەکی ئاشکرا دەکەوێتە هاندانو تەحریك کردنی خەڵكو بانگەوازی فتوای کوشتنی ئەندامانی ڕێکخراوەکەمان دەداتو دەڵێ ئەبێ لە سەلمان ڕوشدی خراپ تریان پێبکەین.

هەروەها لە شەوی 19 لە سەر 1998|3|20دا لە مزگەوتی مەلا زاهیر لە گەڕەکی کورانی شاری هەولێر مەلایەك لە مناسەبەیەکی زەواجی ئیسلامیدا, دەست دەکاتە ئیهانەو سوکایەتی پێکردنی ژنانو دەڵی: ژنانی سفورو مۆدە لە چەشنی سەیارەی تەکسینو ژنانی موحەجەبەو داپۆشراو لە چەشنی سەیارەی تایبەتین!

ئێمە لە وەڵام دانەوە بە قسەکانو فتواکەی مەلا بەشیر, لە بەرواری 1998|3|29دا بەیاننامەیەکمان دەرکردو داوای دادگایی کردنی ئەم مەلایەمان کردووە سەبارەت بە سوکایەتی کردن بە ئەندامانمانو فتوای کوشتنیان لەم بارەوە, گۆڤاری گوڵان لە ژمارە 169 دا لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجام داوە بەدوای دەرچوونی بەیاننامەکەمانو بیستنی خوتبەکەی مەلا



بەشیر. وە مەلا بەشیر لەو دیمانەیەدا, جارێکیتر لە لاپەڕە 18 داو لە ستونی سێهەم, بەناوی دابونەریتی کوردەواریو بەبەهانەی ناموس پەرستی ڕەسمیەت دەدات بە کوشتنی ژنان.

ئاشکرایە, ئەم هەوڵە ڕەزیلانەیەی ئەم مەلایانە ئاکامی ئیفلاسو ناتەواوی ئەوانە لە بەرانبەر هاتنەمەیدانی ژنانو پێشڕەوییەکانی بزووتنەوەی یەکسانیخوازی ژنانو بە تایبەت لە ماوەکانی 8 مارسی ئەمساڵدا, کە ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانو بڵاوکراوەی یەکسانی دەورو نەخشێکی بەرچاویان هەبووە لە هەڵخڕاندنو ڕابەرایەتی کردنی ئەم بزووتنەوەیە, لە پێناو ڕاوەستانەوە بەرووی کۆنەپەرستیو بەدەستهێنانی مافەکانو ئامانجەکانی ژنانی نارازی.

بۆیە ئێمە داواکارین, کە مەلا بەشیرو ئەو مەلایەی مزگەوتی مەلا زاهیر کە سوکایەتیو ئیهانەت دەکەن بەژنانو ئەندامانی ڕێکخراوەکەمان, دادگایی بکرێن. وەهەروەها سەبارەت بە فتواو هاندانو تەحریك کردنی ئاشکرای خەڵك لەلایەن مەلا بەشیرەوە بۆ تیرۆرکردنی ئەندامانی ڕێکخراوەکەمانو بانگەواز کردنی بۆ تیرۆری ژنان بە بەهانەی ناموس پەرستی, دەبێ ئەو مەلایە دادگایی بکرێ بە سزای توند بگەیەنرێ.. وە لەهەمان کاتدا, بۆ وەرگرتنی هەڵوێستێکی توند لە بەرانبەر ئەو کەسو لایەنانەی کە فتواو تەحریك دەکەن بۆ کوشتنی ئینسان لە ئاکامی ئیفلاس بوونیانداو دەست دەدەنە ئەم شێوازە غەیرە مۆدێرنو دژی ئینسانییە. ئەنجومەنی وەزیران ئەرکیەتی بە ڕەسمی ئەم شێوازە قەدەغە بکاتو ئەوکەسو لایەنانەی دەست دەبەن بۆ ئەم شێوازە بە سزای توند بگەیەنرێن.

بە سڵاوی دووبارە

ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان

لقی هەولێر

1998 /04/13

وێنەیەکی بۆ:

_ لایەنە سیاسیو ڕێکخراوە جەماوەرییەکان.

_ دەزگاكانی ڕاگەیاندن.

_ نووسینگەی UN لە جنێڤ.

_ نووسەرانو كەسایەتیە كۆمەڵایەتیو سیاسیەكان.

❊

## ڕاگەیاندنی مەكتەبی سیاسی حیزبی كۆمۆنیستی كرێكاری عێراق

سەبارەت بە كارەساتی تیرۆری هاوڕێیان

(شاپور عبدالقادر_ئەندامی مەكتەبی سیاسی حیزب) و

(قابیل عادل_ئەندامی كۆمیتەی ڕابەری ڕێكخراوی كوردستان)

لە شاری هەولێر

كرێكاران!

خەڵكی ئازادیخواز!

حیزبو لایەنە سیاسییەكانو ڕێكخراوە جەماوەرییەكانو لایەنگرانی ئازادی سیاسیو مافەكانی ئینسان!

سەعات(10)ی سەر لە بەیانی ئەمڕۆ (18|4|1998) لە كاتێكدا وەفدێكی حزبمان بە سەرۆكایەتی هاوڕێ (شاپور عبدالقادر) سەردانی بنكەی یەكێتی بێكارانی كرد لە شاری هەولێر هاوڕێیان (شاپور عبدالقادر_ئەندامی مەكتەبی سیاسی حزب وە هاوڕێ قابیل عادل ئەندامی كۆمیتەی ڕابەری ڕێكخراوی كوردستانو ئەندامی كۆمیتەی مەحەلی شاری هەولێری حزبمان) كەوتنە بەر هێرشێكی موجرمانەی دەستەیەك تیرۆریستو گیانیان لە دەست دا. ئەنجامدانی كارێكی تیرۆریستی بەم شێوەیە لە نێو جەرگەی شاری هەولێردا ڕاستەوخۆ مسئولیەتەكەی دەكەوێتە سەرشانی دەسەڵاتدارانو حاكمانێك كە لەو شارەدا ئیدیعای ئاسایشو وجودی ئازادی هەڵسوڕانی سیاسی دەكەن.



حزبی كۆمۆنیستی كرێكاری عێراق لە بەرانبەر ئەم كردەوە وەحشیانەو ڕەزیلانەیەدا بێدەنگ نابێو كرێكارانو خەڵكی ئازادیخواز دڵنیا دەكات تاوانكارانی ئەم جەریمەیە بە سزای خۆیان دەگەنو لە بەرانبەر ئەو لایەنانەشدا كە لە پشت سەری ئەم تاوانەوە ڕاوەستاوە, هەڵوێستی بەكردەوە دەگرێتە بەر.

تیرۆری هاوڕێیان (شاپور عبدالقادرو قابیل عادل) تەنها تەقەلایەكی زەبوونانەی دوژمنانی كۆمۆنیزمو چینی كرێكار نییە كە لە دژی حیزبی ئێمە ئەنجام درابێ. بەڵكو كردەوەیەكی ڕەزیلانەیە لە بەرانبەر خەباتو تێكۆشانی گشت مەحرومانو ستەمكێشانو ئازادیخوازانی ئەم كۆمەڵگایە. كە ئەمە تیرۆری ڕابەرانی كرێكارانی نەسیجو جگەرەو ڕابەرانی هەزاران ئینسانی ئاوارەو خەڵكی ئازادیخوازو ژنانی ستەم دیدەیە. تیرۆری ڕابەرانی كۆمۆنیستی هەمیشە لەلایەن هێزە بورژوازیو كۆنەپەرستەكانەوە ڕێگایەك بووە بۆ بەرگرتن بە بزووتنەوەی چینی كرێكارو ناڕەزایەتی مەحرومانی كۆمەڵ. كۆنەپەرستان لە كاتێكدا كە دەبینن حیزبی كۆمۆنیستی كرێكاری عێراق وەكو پێشەنگی خەباتی كرێكارانو خەڵكی ستەمدیدەی ئەم كۆمەڵگایە خۆی نیشان داوەو جەسورانە پارێزگاری لە مافەكانی ئەوانو ئازادی سیاسیو حورمەتی ئینسانی ژنانو منداڵان دەكات. بۆیە پەنابردنە بەر ئەم شێوازە ڕەزیلانەیە تەقەلایەكی بێئاكام دەكەن بۆ بەرگرتن بە خەباتو تێكۆشانی مەحرومانی كۆمەڵو حیزبمان.

ئێمە بانگەوازی هەموو خەڵكی ئازادیخوازو حیزبو ڕێكخراوە جەماوەرییەكانو لایەنگرانی ئازادی سیاسیو مافەكانی ئینسان دەكەین, كە لە بەرانبەر ئەم كارە تیرۆریستیەدا دەنگی ناڕەزایەتی هەڵبڕنو بە توندی مەحكومی بكەن.

1998|4|18

❊

## ئەنجومەنی وەزیرانی سەربە پارتی ئیجازەی فەعالیەت بە ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان نادات!

خەڵکی ئازادیخواز! هێزە پێشکەوتنخوازەکان!
ڕێکخراوەکانی دیفاع لە مافەکانی ژنان لە جیهاندا!
نوێنەرایەتی هێزە سیاسییەکانی عێراقیو کوردستانی لە دەرەوەی وڵات!

وەك لەم کیتابە ڕەسمیەی خوارەوەدا دەیبینن, پارێزگاری شاری هەولێر (فرانسوا حەریری) بەپێی کیتابی ڕەسمی ژمارە((230))ی ڕۆژی 12|5|1998 بۆ ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان, بە ناوی ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەڵێت کە ((ڕەزامەندی وەرنەگیرا لە سەر دامەزراندنی ڕێکخراوەکەتان)).

ئەمە لە کاتێکدایە کە ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان, یەکێکە لە ڕێکخراوە ڕەسمیو بە شخسیەتەکانی کوردستانی عێراق. لەزەمانی حوکومەتی هەرێمداو تەنانەت بە پێی یاسا قەرەقووشیەکانی ئەو حکومەتەش یەکێك بووە لە ڕێکخراوە ناسراوو ڕەسمیو شەرعیەکانی ژنان.

ئەم ڕێکخراوە چەندین ساڵە لەسەر ئاستی عێراقو ناوچەکەو جیهان وەك مودافیعی سەرسەختی مافەکانی ژنان لە کوردستان, ناسراوە.

لە کوردستان ڕێکخراوی سەربەخۆ هەزاران ئەندامی هەیەو لە زۆربەی شارەکانی کوردستان ((هەولێر,سلێمانی, قەڵادزێ, ڕانیە, کەلارو کفری, هەڵەبجە, پیرەمەگرون, چەمچەماڵ, دەربەندیخان, تەکیەو ...هتد)) بنکەی هەیەو لە زۆرێك لە وڵاتەکانی دنیا نوێنەرایەتی هەیە. هەتا ئێستا دەیان خەباتو تێکۆشانی بزووتنەوەی ژنانی کوردستانی عێراقی ڕابەرایەتی کردووە. لەوانە کەمپینە بەناوبانگەکانی دژی ڕەشەکوژی ژنان لە کوردستان کە ڕای گشتی جیهان ئاگاداری بوو, خەبات لە دژی قوانینی ئیسلامی ئەحوالی شەخسی عێراقو داڕشتنی قوانینی مۆدێرنی دنیایی ژنان لە شوێنیدا لە کوردستان, خەبات دژی



توندوتیژی لە سەر ژنانی کوردستان کە کەمپینی بەناوبانگی ((دیفاع لە کەژاڵ خدر)) نموونەیەکێتی, چەندین کەمپین لە دژی ملهوڕییەکانی گروپە ئیسلامیە تیرۆریستەکان بەرامبەر بە ژنانی کوردستان, کەمپین بۆ باش کردنی وەزعی کرێکارانی ژنو کردنەوەی دایەنگا بۆ ژنانی کرێکارو کارمەند, لەم دواییانەشەدا ئەم ڕێکخراوە لە ئاستی جیهاندا دەستی داوەتە ((کەمپینی کردنەوەی ماڵی سەلامەتی بۆ ژنان لە کوردستان " Shelter For Women In Kordostan" )).

زۆر بە داخەوە ئەنجومەنی وەزیرانی پارتی دەستی ڕێگری دەنێتە بەردەم ئەم ڕێکخراوە کە هەزاران تێکۆشەری لە ژنانو پیاوان لە پشتە, لە کاتێکدا لە ژێر سایەی ئەودا کەم نفوزترینو بێشەخسیەت ترین گروپی فتواگەری ئیسلامی کە هێلانەی تیرۆریزمو تەدەخولی دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانو ئاسایشی خەڵکی کوردستان تێك دەدەن, ئازادانە لە سایەی ئەودا هەڵدەسوڕێن.

❊

## نامەیەکی کراوە بۆ سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان مەسعود بەرزانی

ڕێ گرتن بە هەڵسوڕانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان,
بە مانای ڕێگرتنو سەرکوت کردنی گشت داواکاریو ناڕەزایەتییەکانی ژنانە لە کوردستان.

بە تاریخی 1998/5/12 لە وەزارەتی ناوخۆی هەرێمی کوردستان _ هەولێر ڕاگەیاندنێك بە ئیمزای فرانسوا حەریری پارێزگاری هەولێر کە دەرچووبوو گەییشت بە دەستم کە دەقی

ڕاگەیاندنەکە دەڵێ (ڕەزامەندی وەرنەگیرا لەسەر دامەزراندنی ڕێکخراوەکەتان بە پێی نووسراوی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران 3176 لە 1998/4/18 بۆ ئاگاداری..)

کە ماوەیەك بەرلەوەش خەبەری قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی یەکسانیم پێگەییشت, کە گوایە لە چەند ڕستەیەکی ووتارێکدا کە لە ژمارە 20 دا بڵاوبۆتەوە, سووکایەتی بە ئایینی ئیسلامو بە ناوی پەیامبەری ئیسلام کردووە.

ئەمە لە کاتێکدا بۆ هەموو کەس لە کوردستان ڕوونە کە ڕێکخراوەی سەربەخۆی ئافرەتان هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە وەك ڕێکخراوەیەکی ڕادیکاڵو پێشکەوتوو بۆ جواب دانەوە بە ناڕەزایەتی بەرینی ژنان ڕاوەستاوە, بە دژی حەملەی تیرۆرو ڕەشەکوژی ژنان کە بە دوای ڕووداوەکانی ئازار بۆ سەر ژنان بەڕێخرا, هەروەها بە دژی لێدانو ئەتك کردنو هەر سووکایەتیو بێحقوقی‌یەك کە دەرحەق بە ژنان دەکرێ, بە دژی قانوونی ئەحوالی شەخسی داڕزیوە کۆنەپەرستەکەی ڕژێمی بەعس کە لە لایەن ئێوەوە دەقاودەق کاری پێدەکرێ.

ئەم ڕێکخراوەیە هەر لە دروست بوونیەوە وەك دەنگی ناڕەزایەتی‌یەکانی ژنانو بۆ دیفاع لە خواستەکانی ئەوان لە مەیداندا بووە.

ئەمڕۆ لە کوردستاندا لە ژێر سایەی حاکمیەتی ئێوەدا سەیرکردنی ژنان بە پلە دوو کەم ئەقڵو زەعیفەو تابع بە پیاوو ڕەوانە کردنەوەیان بەرەو ماڵو کاری ماڵداری وەك کاری ئەسڵی‌یان کە لە خواوە پێیان بەخشرابێ, فەرزتان کردووە بەسەر کۆمەڵگەدا تا دەرەجەی دەست ئاوەڵاکردنی پیاوانی سەرۆك عەشرەتو ئایینی کە زۆر ڕیسواو بێمەسئولانەو ئازادانەو بە ئاسانی چارەنووسی ژنان دیاری کەنو شەلاڵی خوێنیان کەن (غەریبە عومەرو دەلیلە جمیلو مهام خلیلو معتاب نەوزادو چنارو سەکینە توفیقو جیهان حاجی احمدو ڕووناکو... هتد) نموونەی بەرچاوی ئەو جەریمانەن کە لە ژێر سایەی حاکمیەتی ئێوەدا کراوە. بەبێ ئەوەی هیچ قانوونو یاسایەکتان هەبێ بۆ لێپرسینەوەو ڕێگرتن بەم جەریمە وەحشیانەی کە دەرهەق بە ژنان دەکرێ, ژن کوژانو تیرۆریستانی کۆمۆنیستەکانو کەسانی عیلمانیو متمدن, فتواگەران دەست ئاوەڵاو ئازادنو هیچ ئیجرائاتێ لە بەرامبەریان نی‌یەو ناکرێ.



ئێوە باس لە ئازادی سیاسیو دیموکراتیەت دەکەن!

لەهەمان کاتدا ڕێگە بە تیرۆری ژنان دەدەن لەژێر ناوی ناموس پەرستی دابو نەریتی عەشیرەتیدا! بڕیاری داخستنی بنکەی ڕێکخراوی سەربەخۆ دەدەن ڕێ بە بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەی یەکسانی دەگرنو دەنگی ئینسانیو یەکسانیخوازی ژنانی کوردستان سەرکوت دەکەنو ڕێگەش بە باندە تیرۆریستە ئیسلامی‌یەکان دەدەن ئازادانە چالاکی بکەنو بە ئاشکرا لە مینبەری مزگەوتەکانەوە سووکایەتی بە ژنان بکەن, فتوا دەرکەنو ئەمنیەتی خەڵك تێك بدەن!

هەر ئێستا لە کوردستاندا دەبێ شیعاری ئازادی هەڵسوڕانی سیاسیو ڕێکخراوبوون ڕەسمیەتی پێ بدرێ, وە ڕەسمیەتێك کە ڕێکخراوەی سەربەخۆی ئافرەتانو ڕۆژنامەکەی هەیبووەو فعالیەتی کردووە نابێ بە هیچ بیانوویەك قەدەغە بکرێتو نابێ هیچ ڕێگری‌یەك لە بەردەم هەڵسووڕانیدا دابنرێ.

بەردەوامی هەڵوێستی ئێوە لە بەرامبەر قەدەغەکردنی هەڵسوڕانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان مانای دژایەتی‌کردنی ڕاستەوخۆی حاکمیەتی ئێوەیە لە بەرامبەر مافە ئینسانیو ڕەواکانی ژنانی کوردستاندا. ئەمەش لەلایەن هەموو کەسێکی ئینسان دۆستو ئازادیخوازەوە مەحکومەو داوا ئەکەین دەست بەجێ بڕیارەکەی فرانسوا حەریری ئیلغا بکەنەوە.

بژی ئازادی بێقەیدو شەرتی سیاسی!

بژی ئازادی ڕێکخراوبوون!

بژی یەکسانی هەمەلایەنەی ژنانو پیاوان!

نوێنەری ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان/ بەریتانیا

سوسن سلیم

1998/7/13